

ناوی کتێب: باپیرە نوور فێرمان دەکات

بەرگی یەکەم

نووسینی: محمد پاکسو

وەرگێڕانی: دۆستی عوسمان صدیق

پێداچوونەوەی: ...فراو جەمال

# سەرەتا چەند وتەیەك



باپیرە نوور، ناوی مامۆستا (سەعیدی نوورسی)یە.

باپیرە نوورمان، لەماڵێکی سادە و خێزانێکی موسوڵماندا لەدایك بووە و، هەر لە منداڵییەوە بە خوێندنی زانست و زانیاریی گۆش بووە.. هەرچەندە لە وانەکانیدا ڕووی دەمی لە ڕۆڵەکانی وڵاتەکەی خۆی بووە، بەڵام لەڕاستیدا گشت مرۆڤایەتی لە وتە و تێڕوانینەکانی سوودمەند بوون.

لە قۆناغی منداڵی و سەردەمی گەنجێتی و ساڵەکانی خوێندنیدا بە جۆش و خرۆشەوە وانەی خوێندووە و، هەوڵی داوە زۆرترین زانست و زانیاریی بەدەست بهێنێت.

شارەزای زانستە ئایینییەکان بووە و، فێری زانستەکانی فیزیا و کیمیاش بووە، لە بواری فەلسەفەشدا شارەزاییەکی باشی هەبووە، نەوەد کتێبی لە زانستە جیاجیاکاندا لەبەر کردووە.

بووە بە مامۆستا و، خوێندکاری پێگەیاندووە، هەرگیز لە خوێندنەوە و، نووسین و، خوێندەوارکردنی کەسانی دیکە ماندوو نەبووە و، هەموو نەوەد ساڵی تەمەنی بەم چەشنە گوزەراندووە.

ئەمەی سەرەوە کورتەی ژیانی باپیرە نوور بوو.. بەڵام ئایا لەبارەی چییەوە کتێبی نووسیوە؟ خەڵکی فێری چی کردووە؟ لە چ بوارێکدا کارامە بووە؟ چ شێوازێکی بەکارهێناوە؟

بەڵێ، باپیرە نوور لە گشت وانە و نووسین و پەرتووکەکانیدا باسی لە تەنها بابەتێك کردووە، ئەویش (ئیمان)ە.

ئیمان چییە؟ ئێمە چۆن بە رامان و بیرکردنەوە لە بوونەوەران بەدیهێنەرمان بناسین؟ چۆن لە ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە وردبینەوە و لێیان تێ بگەین؟ چۆن بتوانین پەروەردگارمان بناسین و باوەڕی پێ بهێنین؟ بە چ شێوازێك لە قورئان بڕوانین و لێی تێ بگەین؟ پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) چیمان فێردەکەن؟ بەهەشت و دۆزەخ چین؟ مرۆڤ بۆ چ مەبەستێك لەم دنیایەدا بەدیهێنراوە؟ ئەرکەکانی سەرشانی کامانەن؟

چۆن خودا بپەرستین؟ بۆچی دەبێت ملکەچی بڕیار و فەرمانەکانی خودا بین؟

کتێبە هەرە دیارەکانی باپیرە نوورمان بریتین لە: (وتەکان، مەکتووبات، تیشکەکان، بریسکەکان)، کە هەریەکەیان تەفسیری قورئانی پیرۆز و بابەتە ئیمانیی و ژیربێژییەکانە و، بە شێوازێکی سەرەنجڕاکێش نووسراون.

ئێمەش بۆ دارشتنی ناوەڕۆك و بیرۆکەی بابەتەکانی ئەم کتێبە بە پلەی یەکەم سوودمان لە کتێبی (وتەکان) وەرگرتووە.

هەوڵماندا‌وە بە شێوەیەکی زۆر ئاسان خوێنەری بەڕێز بە ژیاننامە و بەرهەمە بەنرخەکانی باپیرە نوور (سەعیدی نوورسی) ئاشنا بکەین و، هیواداریین سوودێك بگەیەنین.

بەم شێوەیە ناوی خوا لە کتێبی یەکەمی ئەم زنجیرە نوورینە دێنین و، خوا یار بێ بەرگەکانی دیکەشتان پێشکەش دەکەین.

محمد پاکسو

# مانگا و بزن چۆن (بسم الله) دەکەن؟

"ئـەم وشـە پـاراو و پـیرۆزە هـەروەك دروشمـی ئیسـلامە، لەهەمان کاتدا زیکر و ویردی هەموو بوونەوەرانیشە بە زمانی حاڵیـان... هـەموو شـتێك لـەم بوونـەوەرەدا کارەکانیـان بـە (ناوی خوا)وە جێ بەجێ دەکەن.. ئەو ئاژەڵە پڕ سوودانەی وەك: بزن و مەڕ و مانگـا و حوشـتر، هەریەکـەیان کـە (نـاوی خـوا) دەبـات، گوانـەکانی دەبنـە کانییـەك و شـیریان لێ هەڵـدەقوڵێت. بـەم چەشـنە و بـە (نـاوی ڕۆزیـدەر)ەوە خاوێنترین و باشترین خۆراکمان پێشکەش دەکەن"[1].

مەەەەەەە! ماااااااا! بااااااع!

زمان و دەنگی مانگـا و بـزن، هێنـدە خـۆش و سـەیرە، کـە تـەنها تایبەتـە بـە خۆیان و، لە جوانی خۆیان دەوەشێتەوە.

---

١- ئـەم دەقـە لـە وەرگێڕانەکـەی مامۆسـتای بـەڕێز (فـارووق ڕەسـوڵ یـەحیاوە) وەرگێراوە، بڕوانە: وتەکان، وتەی یەکەم، لا ٦ و ٧ و ٨.

– باشە تەنها بزن و مانگا قسە دەکەن؟

– بەدڵنیاییەوە نەخێر!

– کەواتە زیندەوەرانی دیکەش قسە دەکەن؟

– بەڵێ، هەر جۆرە ئاژەڵێك زمانێکی تایبەت بە خۆیان هەیە، کە لە نێوان خۆیاندا قسەی پێدەکەن، مێرووولەکان بەدەم کارکردنەوە بە زمانێك دەدوێن، هەنگەکانیش لەسەر پەڕەی گوڵان بە زمانێکی دیکە یەکتری دەدوێنن، باڵندەکانیش زمانێکی جیاواز لەوانیان هەیە، بێگومان ماسییەکان شێوازێکی قسەکردنی تایبەت بە خۆیان هەیە، کەواتە مار و مێروویش بە زمانی خۆیان دەدوێن و دەفیشکێنن و دەزیکێنن...

لە باسی زمانی باڵندەدا، سولەیمان پێغەمبەرم هاتەوە یاد (سەلامی خوای لێ بێت) کە لەگەڵ باڵندەکاندا قسەی دەکرد و، ئەمەش موعجیزەیەکی تایبەت بەو پێغەمبەرە بووە.



لە سورەتی (ئەلنەمل)دا چیرۆکی (پەپوسلێمانە) هاتووە، کە چۆن لەگەڵ سولەیمان پێغەمبەردا دواوە، هەر لەم سورەتە پیرۆزەدا خوای گەورە باسی مێرووولەیەکمان بۆ دەکات، کە لەگەڵ مێرووولەکانی دیکەدا قسەی کردووە و، حەزرەتی

سولەیمانیش گوێی لێ بووە و لێی تێگەیشتووە! بەڕاستی کاتێک یەکەمجار ئەم ئایەتە پیرۆزانەم خوێندەوە زۆر سەرم سوڕما و، وتم کەواتە مەڕ و بزن و مانگا و حوشتریش هەروەک ئێمە زمانیان هەیە و قسەی پێدەکەن؟

ڕەنگە هەندێ جار ئەم ئاژەڵانە لە کاتی قسەکردنیاندا دەنگیان لێوە بێت، بەڵام زۆرجار لە ناخەوە قسەدەکەن و دەنگیان لێوە نایەت، واتە ئەوان ماندوونەناسانە بە کارکردن و بەرهەمهێنان قسە و پەیامی خۆیان دەگەیەنن بە بوونەوەرانی دیکە.

– باشە بزن و مانگا لە هیچ خوێندنگەیەکدا خوێندوویانە؟ تۆ بڵێی هیچ خولێکیان بینیبێت؟

– هەرگیز بڕواناکەم شتی وا بووبێت! من تا ئێستا خوێندنگەی مانگام نەبینیوە، دڵنیام ئێوەش شتی واتان نەبیستووە.

– خۆ نازانن خوێندنگە و زانیاریی چییە، ئەی چۆن فێری شتەکان دەبن و کارەکانیان ڕایی دەکەن؟

دیارە کارگەی شیریان هەیە، ئەگینا ئەوان کە هیچ لە زانست و تەکنەلۆژیا نازانن و سەری لێ دەرناکەن، چۆن دەتوانن ئەم شیرە بەتام و خۆشە بەرهەم بهێنن؟

– ئەم پرسیارە تەنها یەک وەڵامی هەیە:

(بێگومان بە ناوی خودا هێنان و لەسەر ناوی ئەو کارکردن).

– باشە چۆن دەزانین (بسم الله) دەکەن؟

– لەوەوە دەزانین کە ئەوان بە توانا و بیر و ژیریی سادەی خۆیان ناتوانن کارێکی هێندە بێ وێنە ئەنجام بدەن و، هەروەك ئەوە وان کە لە جێگایەکی دیکە فێرکرابن، پاشان نێردرابنە سەر زەوی؛ چونکە ئەم ئاژەڵانە لەگەڵ لەدایکبوونیاندا زوویەزوو دەزانن لەسەر پێی خۆیان ڕاوەستن و، پاش چەند ڕۆژێك دەکەونە هەڵبەز و دابەز و، لە ماوەی بیست ڕۆژێکیشدا ئەوەی پێویست بێت فێری دەبن و دوای ئەوە پێویستیان بە دایك و باوکیان نامێنێت.

– ئێمەی مرۆڤیش هەر بەو شێوەیەین؟



– ئێمە تا دوا ساتەکانی تەمەنمان هەر پێویستمان بە دایك و باوکمانە.

پەروەردگار بەر لە لەدایکبوونی ئاژەڵان گشت کار و ئەرکەکانی فێرکردوون، واتە دەتوانین بڵێین پێش لە دایکبوونیان وانە و دەرسی خۆیان خوێندووە. ئەوەتا ئاژەڵێکی وەك بزن شیرێکی خاوێن و بەتام و بەلەزەتمان پێشکەش دەکات، لە کاتێکدا نەخوێنی تێکەڵ دەبێت و نە پاشەڕۆ، ئەمە لە کاتێکدا کە شیرەکەی بۆ خۆشی نییە، بەڵکو بۆ بەچکەکەی یا مرۆڤەکانە.



# خاوەنی ئەم بوونەوەرە مەزن و جوانە چیمان لێ داوا دەکات؟

"پرسیار: هەرکەسێك کە دەبێت بە هۆکاری ئەوەی نیعمەتێکمان دەست بکەوێت، هەردەم لە پاداشتیدا ڕێزی لێ دەگرین. ئەی ئایا خاوەنی ڕاستەقینەی ئەم هەموو نیعمەت و ڕۆزییە زۆرانە چیمان لێ داوا دەکات؟

وەڵام: ئەو نیعمەت بەخشە ڕاستەقینەیە لەبەرامبەر ئەم هەموو جۆرە نیعمەت و ڕۆزییە زۆرانەوە؛ داوای سێ شتمان لێ دەکات:

**یەکەم**: یاد و ناوی خوا بردن (الذکر).. **دووەم**: شوکر و ستایش (الشکر)، **سێیەم**: بیرکردنەوە لە گەورەیی زاتی موبارەکی خۆی (الفکر).

که لەسەرەتای کارەوە (بسم الله) دەکەین، ئەمە (زیکر)ە.

که لە کۆتاییدا دەڵێین سوپاس بۆ خوا (الحمد لله)، ئەمە (شوکر)ە.

که لە نێوان (بسم الله) و (الحمد لله)شدا بیر لە دەستەڵات و موعجیزەی خوای میهرەبان دەکەینەوە لەو نیعمەتانەی کە هەر یەکەیان موعجیزەیەکی توانستی خوای تاك و بێ وێنەیە و، دیارییەکە لە دیارییەکانی میهرەبانیی فراوانیی ئەو خوایە.. کاتێ بیر لەمانە دەکەینەوە، ئەمە (فیکر)ە"[1].

---

١- ئەم دەقە لە وەرگێڕانەکەی مامۆستای بەڕێز (فارووق ڕەسووڵ یەحیاوە) وەرگیراوە، بڕوانە: وتەکان، وتەی یەکەم، لا ٩.

- وەرە بۆ سێو! سێوی بەتام! سێوی ئەماسیایە! ترێی ئیزمیرە تامی وەك هەنگوینە![1]

- کاکە کیلۆی بەچەنە؟ ئا بێ زەحمەت سەر و کیلۆیەکم لە هەردووکیان بۆ بکێشە، بەس ئا لەو سێوە لاسوورانەم بۆ تێکە، لەو ترێ زەردە ئاڵەشم بۆ بکێشە، بەخوا ماشەڵا جوان پێگەیشتووە...

بەم شێوەیە پارەکەی دەدەین و، بە کیلۆ و بە عەلاگە دەیکڕین... دواتریش نۆشی گیانی دەکەین.

کاکەی فرۆشیار و، برای جوتیار ناتوانن تەنها سێوێك، یاخود دەنکە ترێیەك لە نەبوونەوە بهێننە بوون، کارگەی بەرهەمهێنانەکەشی لە خۆڵێکی سادە زیاتر نییە، ئامێرەکەشی دارێکی بێ گیان و، بێ عەقڵ و، دەست و پێ بەستراوەیە، کە لق و پۆکانی بەناویەکدا چوون و، تەنانەت خۆیشیان بۆ ڕێکنابێتەوە...

باشە درەختێکی بێ دەستەڵاتی لاوازی بەمجۆرە، چۆن دەتوانێت سێوێکی وا ناسك و خۆشتام بەرهەم بهێنێت؟ جگە لەوەش دارەکە خۆی ماددەی خۆراکیی لە گڵ و خۆڵەوە پێ دەگات، کەچی بەرێکی زۆر بەتام و شیرین و بەلەزەتمان بۆ بەرهەم دەهێنێت.

لە ڕواڵەتدا دار و درەختەکان زۆر لاوازن، بەڵام گەر لە ڕەگەکەی بڕوانیت، دەبینیت ئەو ڕەگە باریکانە زەوییان شەقکردووە و بە

---

[1]- ئەماسیا و، ئیزمیر: دوو شارن لە وڵاتی (تورکیا).

ناخیدا ڕۆچوون، تا درەختەکەش گەورەتر بێت، ئەم ڕەگانەش زیاتر بە قوڵایی و ناخی زەویدا ڕۆدەچن..

بیربکەنەوە، ئێمە بە چەند ئامێری هەڵکەندن ئینجا دەتوانین بگەینە ئەو شوێنەی ڕەگی دارەکانی پێی گەیشتوون!! ئێوە دەڵێن ئەم هێز و توانا سەرسوڕهێنەرەی لە کوێوە دەستکەوتووە؟

بمانەوێت و نەمانەوێت هەموومان (بسم الله) بەسەر زمانماندا دێت، وانییە؟

ئاخر لەبەر ئەوەی ئەو ڕەگانەش بە ناوی ئەو زاتەوە کاردەکەن کە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، هەر بۆیە خاکی وشك و ڕەقیش شی دەبێتەوە بۆیان و، بە خۆشەویستییەوە ڕێگەیان بۆ دەکاتەوە تا بەناویدا ڕۆبچن.



– کێ خاوەنی سێوە؟

– خاوەنی بنەڕەتی سێو فرۆشیار نییە، جوتیاریش نییە، خۆ دار و خاك و خۆڵیش نییە.

– ئەی کێیە؟

– جا لە وەڵامی ئەمە ئاسانتر هەیە؟ ئەو زاتەیە کە فەرمایشتەکانی لەسەروو هەموو توانایەکەوەیە و، دەستەڵاتی بەسەر هەموو بوونەوەراندا دەشکێت...

تۆ کە دەیکڕیت پێنج شەش دینارێك دەدەیت بە فرۆشیارەکە، باشە ئەی چی دەدەیت بە بەدیهێنەر و ڕەوانەکەرەکەی؟

فرۆشیار تەنها ڕێگەیەکی دووری بۆ نزیك کردووینەتەوە، ئێمەش بەو جۆرە هەقەکەی دەدەینێ، بەڵام ئەو پەروەردگارەی کە بەو جۆرە تاموچێژ و ڕەنگی داوە بەو بەروبوومانە دەبێت چی دەرهەق بکەین؟

سێ وەڵام:

یەکەم: یادکردنەوە؛ بەسەرزاراهێنانی ناوە پیرۆزەکانی پەروەردگارمان، کە نیعمەتی سێوی پێ بەخشیوین، بۆیە کاتێك دەمانەوێت بیخۆین، گەر سەرەتا بڵێین: "بسم الله"، ئەمە هەروەك ئەوە وایە کە بڵێین: "خودایە، بە ناوی تۆوە دیارییەکەت وەردەگرم، چونکە وا هەستدەکەم کە ناوی پیرۆزی تۆی لەسەر نەخشێندراوە".

دووەم: سوپاسگوزاریی؛ دەڵێین: "خوایە گیان، سوپاسی تۆ دەکەم کە سێوێکی هێندە بە تام و ناوازەت پێ بەخشیوین، سوپاس و ستایش بۆ تۆ ئەی ڕۆزیدەرمان".

جگە لەو زاتە کەسی دیکە دەتوانێت سێوێك بێنێتە بوون؟ بێ گومان ئەگەر مرۆڤەکان توانای کارێکی وایان هەبووایە، ئەوا سێوێکیان بە بڕێك زێڕ یا زیو دەفرۆشت!

سێیەم: بیرکردنەوە؛ واتە لێ وردبوونەوە و ڕامان، بەڵام چۆن؟

ئەم سێوە شاکارێکی خواییە، بەرهەمی کارێکە کە لە توانای مرۆڤ بەدەرە، هەر لە توێکڵەکەیەوە تا ناوکەکەی و تامەکەی هێندە بێوێنەیە، کە مرۆڤەکان کرداری تێگەیشتنیان لە پێکهاتە و سوودەکانی بە پێشکەوتنی زانستیی مرۆڤایەتی بزانن، واتە هەر زۆر بەدوور و تەنانەت بە مەحاڵیشی دەزانن کە هەوڵ بدەن هاوشێوەی دروست بکەن؛ چونکە دروستکەر و بەدیهێنەری سێو تەنها یەك زاتە، هەر ئەو زاتەش مانگ و خۆر و دنیای خولقاندووە.



ئەو بەدیهێنەرە هیچ پێویستی بەم سێوە نییە، ئەوە ئێمەین کە دادەمێنین بۆ لەتێك لەو سێوە و بۆن و بەرامە و تامی.

کەواتە، زاتێك ئەم سێوەی بە تایبەت بۆ ئێمە خولقاندووە، کە هەم دەمانناسێت و دەزانێت پێویستمان بە چییە و، هەمیش خۆشیدەوێین.

کاتێك سێو دەکڕین، نرخی سێوەکان دەدەینە فرۆشیار و، سوپاسیشی دەکەین، بەڵام ئەگەر لەبەرامبەر ئەو نیعمەتەدا سوپاسی بەدیهێنەری ڕاستەقینەی نەکەین، چ بێ ڕێزییەکی گەورەمان نواندووە!

# کێ خاوەنی بوونەوەرە؟



"تۆ گومانت لەو ڕاستییەدا نییە گوندی بێ کوێخا و.. دەرزیی بێ وەستا و خاوەن و.. پیتی بێ نووسەر نییە و نابێت. ئەی ئایا چۆن ئەوە بەخۆت ڕەوا دەبینیت کە پێت وابێت ئەم گەردوونە ڕێکوپێک و ڕەنگینە بێ پادشا و فەرمانڕەوا بێت؟"[1].

قەت لە خۆتان پرسیوە بۆچی گوند بێ کوێخا و دەرزی بێ وەستا و پیت بێ نووسەر نابێت؟

– ئەمە لەبەر ئەوەیە کە نابێت شوێنێك بێ بەڕێوەبەر بێت، دەنا ڕێکوپێکی و یاسا و هێمنی و ئاسایش لەو شوێنەدا نامێنێت.

هەر شارێکیش دانیشتوانەکەی ژیانێکی پڕ هێمنی و ئاسایشیان هەبێت، ئەوا بێگومان ئەو ناوچەیە فەرمانڕەوایەکی کارامە بەڕێوەی دەبات.

---

١– ئەم دەقە لە وەرگێڕانەکەی مامۆستای بەڕێز (فارووق ڕەسووڵ یەحیاوە) وەرگێراوە، بڕوانە: وتەکان، وتەی دەیەم، لا ٦٠.

نموونەیەکی زۆر سادە: تەنانەت (دەرزی)یەکیش دەبێت وەستایەك دروستی کردبێت، یاخود کارگەیەك بەرهەمی هێنابێت، خۆ بەهەرەمەکی لە خۆیەوە نەبووە.

- بۆچی؟

- چونکە ئەو دەرزییە بە چەند کردارێکدا تێپەڕبووە، تا ئاوا دروست کراوە و، نووکەکەی تیژکراوە و، کونێکیشی تێکراوە، بەکورتی بەجۆرێك دروست کراوە کە بە ئاسانی بەکاربهێنرێت.

گەر تەماشای سەرپاکەتی دەرزییەکەش بکەن، بێ گومان ناو و ناونیشانی کارگەی بەرهەمهێنەری لەسەرە.

گەر ڕۆژێك چوویتە پۆلەوە و، بینیت لەسەر تەختەڕەشەکە بە گەورەیی پیتێکی (ی) نووسراوە، لێرەدا یەکەم شت چی دێت بە خەیاڵتدا؟

دەبێت هاوڕێیەکم ئەمەی نووسی بێت، وانییە؟ خۆ هیچ کام لە هاوڕێکانت -بە خۆشتەوە- ناڵێن: "هەبێ و نەبێ ئەم پیتە خۆی خۆی نووسیووە!".

یاخود "ئەو تەباشیرە لە بەیانییەوە خۆی خەریك کردووە تا ئەو پیتەی نووسیووە!"، ئەگەر وا بڵێن، بێگومان پێتان دەوترێت: "ئەوە تۆ عەقڵت لە دەستداوە؟" .

کەواتە تەنها پیتێکیش لەخۆیەوە نانووسرێت.

جا با لەم جیهانە و بوونەواران وردبینەوە، ئەو دەریا فراوانە، ئەو باڵندە جوانانـە، ئـەو پەپوولـە ڕەنگاوڕەنگانـە، ئـەو گوڵانـە کـە باخچەکانیان ڕازاندووەتەوە، ئەو هەموو مێرووە.. بێگومـان دەپرسـن ئـاخۆ ئـەو نەخشەسـاز و ئەنـدازیارە بەتوانایـە کێیـە کـە ئەمانـەی نەخشاندووە؟

– ئەی بەدیهێنەری ئەم چیا سـەرکەش و بڵندانـە، ئـەو هەورانـە، ئەو مانگ و خۆر و هەسارە و ئەستێرە بێ شومارانە کێیە؟

– ملیۆنەها ساڵە ڕۆژانە خۆر هەڵدێت و ئـاوا دەبێـت و، زەوی لـە بۆشایی ئاسمانـدا لەسـەر خولگەیـەکی دیـاریکراو دەخولێتـەوە، شـەو دێـت و دەڕەوێتـەوە، وەرزەکـان بـە دوای یەکـدا دێـن، مـرۆڤ لـەدایك دەبێت، گەورە دەبێت و بەساڵادەچێت و، لە کۆتاییشدا کۆچی دوایـی دەکات.



هـەزارەها باڵنـدە لـە ئاسمانـدا بێ ئـەوەی بەیەکدا بـدەن دەفـڕن، ملیارەها ئەستێرە بێ بەریەککەوتن لەسەر خولگەکانیان دەخولێنەوە.

ئەمانە تەنها چـەند نموونەیـەك بوون، ئێوەیش دەتوانن هەرچی بەخەیاڵتاندا هات، بۆ ئەم نموونانـەی زیاد بکەن.

- ئایا ئەم هەموو کار و چالاکییەی ڕۆژانە بەبەرچاومانەوە ڕادەپەڕێنرێن، هەر لە خۆیانەوە دەبن؟ ئەمانە خاوەنێك، بەڕێوەبەرێك، چاودێرێکیان نییە؟

- بێگومان هەیانە.

- دەگونجێت نەبێت؟

- نەخێر، ناگونجێت نەبێت.

- ئەی ئەوانەی دەڵێن: "خودا نییە و هەموو شتێك بە ڕێکەوت دروست بووە و، هەرەمەکی بەڕێوە دەچێت" تا چەند ڕاست دەکەن؟

- دیارە کە هەرگیز ڕاست ناڵێن.

گەر تەنانەت گوندێکی بچووك و دوورەدەستیش کوێخای هەبێت، کەواتە گەردوونێك بەم فراوانییە بێگومان بەدیهێنەر و چاودێرێکی هەیە.

ئەگەر دەرزییەك وەستایەکی هەبێت کە دروستی کردووە، ئەوا بەدیهێنەرێکیش هەیە کە پێکهاتەکانی لە کرۆکی زەویدا بەدیهێناوە.

ئەو زاتەش خودای مەزن و بێ هاوبەش و تاك و تەنیایە.[1]

---

١- لە وتەی (دەیەم)ەوە وەرگیراوە.



## دەتوانین خوای گەورە لەڕێی ناوە پیرۆزەکانییەوە بناسین..

– پەروەردگارمان چۆن بناسین؟

– بەدڵنیاییەوە بە هۆی ناوە پیرۆزەکانییەوە.

– چۆن؟

– خوای گەورە (خالق)ە، واتە ئەو بەدیهێنەرەیە کە لە نەبوونەوە بوونەوەری هێناوەتە بوون.

هەموو شتێکی خولقاندووە، من، دایکم، باوکم، خوشك و براکانم، هاوڕێکانم، باپیرە و داپیرەم، دراوسێکانمان.. گشت مرۆڤەکان.

لە سەرەتای دروستکردنی زەوییەوە تا ئەم ساتە وەختە و تا کۆتایی دنیاش، خوای گەورە تاکە بەدیهێنەری هەموو مرۆڤەکانە.

– ئایا تەنها مرۆڤەکانی دروستکردووە؟

– نەخێر، بەڵکو هەموو ڕووەکەکان، ئاژەڵەکان، دار و بەرد و خۆڵ، دەریا و وشکانی، مانگ و خۆر، هەسارە و ئەستێرەکان خوای باڵادەست بەدیی هێناون.

دنیا و، دواڕۆژ و، بەهەشت و، دۆزەخ و، ئەوەی کە دەیبینین و، ئەوەیش کە نایبینین و، ئەوەی کە دەیزانین و دەیناسین، لەگەڵ ئەو شتانەش کە دەرکمان پێنەکردوون.. ئەمانەش خوای گەورە دروستی کردوون.

لە ڕاستیدا هەموو بوونەوەران ڕۆژانە چەندین جار یادی خوا دەکەن و دەڵێن: "ئەی خالق، یا الله".

***

– ئایا ئەو زاتە پاش ئەوەی بوونەوەری بەدی هێنا، هەروا لێیان گەڕا و فەرامۆشی کردن؟

– نەخێر، بەڵکو خواردن و خواردنەوە و بەرگ و هەموو شتێکیشی بۆ دابین کردن کە بۆ بەردەوامیی ژیانیان پێویست بێت و، ڕزق و ڕۆزی زۆریشی پێ بەخشین.



ڕزق و بژێوی من و هەموو مرۆڤەکانی بێ جیاوازی و ناعەدالەتی فەراهەمهێناوە و، پێداویستی هەموو کەسێکی باوەڕدار و بێباوەڕیشی دابینکردووە.

کەواتە پەروەردگارمان ڕزقی هەموو پشیلەکان، هەموو باڵندەکان، هەموو ماسییەکان، مار و مێروو و گشت

ئاژەڵەکانیش دەستەبەر دەکات.

هەموو پێداویستییەکانی درەخت و گوڵ و گشت ڕووەکەکانیش فەراهەم دەکات، بۆ بەردەوامیی ژیانی سەر ڕووی زەوی، ئاو و هەوای بۆ گونجاندووین و، خۆری وەك سەرچاوەیەکی وزە و ڕۆشنایی بۆ بەدی هێناوین، بێ ئەوەی کز بێت و، بەبەردەوامی لەکاردایە.

خوای گەورە ئەم جیهانەی بە ڕەنگ و ڕووناکی و جوانییەکان بۆ ڕازاندووینەتەوە، بەڵام هەروا بە هەڕەمەکی نا، بەڵکو بۆ بینینی ئەو جوانیانە چاوی پێ بەخشیووین و، لەڕێی چاومانەوە هەستی بینینی پێ بەخشیوین، ڕووناکیشی کردووەتە پردێك بۆ گەیاندنی جوانییەکان بە بیلبیلەی چاوەکانمان.

ئەو زاتە چاوی هەر میللەتێکی بە شێوەیەکی جیاواز و تایبەت نەخشاندووە، نەك تەنها میللەتان، بەڵکو چاوی هەموو کەسێکی جیاواز لە چاوی یەکێکی دیکە خولقاندووە.

– ئایا چاوی تەنها بە مرۆڤەکان بەخشیووە؟

– نەخێر، خوای گەورە بینایی چاوی بەخشیوە بە مێش و مێرووله و، مار و، ڕێوی و، ورچ و، مەیمون و، پشیلە و، سەگ و، مریشك و، هەڵۆ و، ماسی و، نەهەنگ و، هەموو زیندەوەران و ئاژەڵان.

چاوی هەر زیندەوەرێك تایبەتمەندی خۆی هەیە و، شێواز و ئاستی بینین و تەماشاکردنیشیان جیاوازە لە یەکتری.

کەواتە بەشێوەیەکی ڕێکوپێك و سەرسوڕهێنەر (چاو و، توانای بینین و، بوونەوەر و، تیشك) دەبنە مایەی ئەوەی من لە بەدیهێنراوەکانی خوای گەورە بڕوانم...

پەروەردگاریشمان ئەمەی بۆیە پێ بەخشیوین، تا بەهۆیەوە زاتی موبارەکی بناسین.

ئێمە تەنها لە دووری و ڕووناکییەکی دیاریکراودا توانای بینینمان بەکارە، بەڵام پەروەردگار هەموو شتێك دەبینێت، بە گەورە و بچووکەوە، بە گشت وردەکارییەکانییەوە.

توانای بینینی ئێمە لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا گۆڕانکاری بەسەردا دێت، تا ئەوەی لە ساتەوەختی مەرگدا بە تەواوەتی دەکوژێتەوە، بەڵام بینینی خودای مەزن بێکۆتایە و، نەکزبوونی هەیە و، نەخامۆش بوون.

کەواتە ئێمەی مرۆڤ و گشت ئەو بوونەوەرانەش کە هەستی بینینیان هەیە، بە بینینمان بە شێوەیەك لە شێوەکان یادی خودا دەکەین و، دەڵێین: "ئەی (بەصیر)، یا الله". بە توانای بینینی خۆمان دەرك بە ناوی پیرۆزی (ئەلبەصیر) دەکەین.

***

خودای گەورە جوانیی و قەشەنگییەکی ناوازەی بە هەموو دروستکراوەکانی بەخشییوە، هەموو بوونەوەرێك بەشی خۆی جوانیی و، ئێسك سووکیی و، دلگیریی و، چاومەستیی تێدا بەدی دەکرێت.

منداڵ جوانـە، دایك جوانـە، بـاوك جوانـە، خوشـك و بـرا جـوانن، منیش، لەبەر ئەوەی دروستکراوی ئەو زاتە مەزنەم، جوانم.

گوڵاڵەسـوورە جوانییـەکی جیـاواز لـە گوڵـەباخی هەیـە، جـوانیی ئەویش جیاوازە لە جوانیی گوڵی هەنار.

گوڵەکانی درەختی پرتەقاڵ جوانن، هێشووە ترێـی نـاو ڕەزەکـان جـوانن، میـوەی قەیسـی بەدارەکەیـەوە جوانـە، سـنەوبەر و چـنار و شۆڕەبی جوانن.. هەریەکە لەمانە جوانییەکی تایبـەتی تێدایـە، تـەنها ڕووەکـەکان و ڕەز و بـاخ و گـوڵ و دارسـتانەکان جـوان نـین، بـەڵکو هــەموو ئــاژەڵ و زینــدەوەران جوانییان تێدا بـەدی دەکرێـت، مــەڕ جــوانیی خــۆی هەیــە، چـۆلەکە جـوانیی خـۆی هەیـە، پەپوولە و، مێروولە و، کیسـەڵ و، ماسـییەکانیش هەریەکـە بـە شــێوەیەکی سەرســوڕهێنەر جوان و ڕازاوەن.



ئاسمــان جوانــە، دەریــا جوانە، خاك جوانە، ئاو جوانە، هەورەکان جوانن، خۆر جوانە، مـانگ جوانە، دنیا جوانە، دواڕۆژ جوانە، بەهەشت جوانە..

پێغەمبەرمان ﷺ جوانە، قورئانی پیرۆز جوانە، ئیسلام جوانە، ئیمان جوانە، نوێژ جوانە، ڕۆژوو جوانە، خۆشەویستی جوانە، ڕێزگرتن جوانە...

- باشە لەم گەردوونەدا چەندە جوانیی هەیە؟

- لە ژمارە نایەت.

جوانیی هەموو ئەم بەدیهێنراوە لە ژمارە نەهاتووانەش، لە جوانییەکی نەبڕاوەوە سەرچاوەی گرتووە و، پرشنگدانەوەی ناوی پیرۆزی (ئەلجەمیل)ی پەروەردگارمانە لەسەر زەوی و لە گەردووندا.

واتە هەموو بوونەوەران بەو پەروەردگارەی کە بە جوانی بەدیی هێناون، دەڵێن: "ئەی (جەمیل)، یا الله".

***

لە هەموو بوونەوەرێکدا شوێن پەنجەی سۆز و بەزەیی و میهرەبانییەك بەدی دەکرێت.

داری هەنجیر لەناو خاکدا باڵا دەکات، کەچی تامی شیلەیەکی هەنگوین ئاسا لە هەنجیرەکانیدا دەچێژین، کە ئەمە خۆی بۆ خۆی جۆرە سۆز و بەزەییەکە لە بەری ئەو درەختەوە پێمان دەگات.

شلیکیش هەر بەهەمان شێوەی هەنجیر لە خاکدا گەشە دەکات، بەڵام شلیکی سوور و بەتام و خۆشمان پێشکەش دەکات.

ئەی ئاژەڵەکان! بەتایبەت ئاژەڵی شیردەر، لەگەڵ لەدایکبوونی بەچکەکانیدا بەوپەڕی سۆز و بەزەییەوە بەخێویان دەکەن.

جانـەوەرێکی درِەنـدەی وەك مێیـەی شـێر (دەڵەشـێر)، کاتێـك دەبێت بە دایك زۆر بـە بەزەییانـە شـیر دەدات بـە بەچـکەکانی و، بۆ ئـەوەی لـە ئاژەڵـە درِنـدەکانی دەوروبـەری بیانپارێزێـت، هـەروەها چاودێرییان دەکات، تا ئەوەی کەمێك گەورە دەبن خۆی خۆراکیان بۆ پەیدا دەکات.



پڵنگ و گـورگ و ورچ و.. هتـدیش، هـەموویان بەهەمان وێنەی دایکەشێر بـە بـەزەیی و سـۆز و میهرەبانییەوە بەچکەکانیان بەخێو دەکەن.

پشیلەشتان بینیوە، کاتێك بێچووی دەبێت چ دایکێکی میهرەبـان و بەسـۆزە و، شـیریان پێـدەدات و، بـەخێویان دەکـات و، لـە زیـان و درِنـدە دەیانپارێزێـت و، دەیانگێرِێـت و، فێریـان دەکـات چـۆن پشـت بـەخۆیان ببەسـتن، وەك رِێنیشـاندەرێك دەبێت بۆیان.



مریشـکیش لـەم تـابلۆی سـۆز و بەزەییەدا هیچی لە پشیلە کـەمتر نییـە، یـەك یـەکی جووجەڵـەکانی بـەجوانی بـەخێو دەکـات، هـەر لـەو سـاتەوە کـە هێلکەکانیان دەتروکێنن و دێنـە ئـەم دنیایـەوە، تـا تـەواو پێدەگـەن،

دایکە مریشك لـە ئـاژەڵی درنـدە دەیانپارێزێـت، تەنانـەت گـەر گیـانی خۆشی بخاتە مەترسییەوە.

ئـەوە خـۆ سـۆز و میهرەبـانی و خۆشەویسـتی و هـۆگری دایکـی خۆمان هێندە مەزنە، بە زمان وەسف ناکرێت.

هەموو دایکێك بۆ منداڵەکانی خۆی پاڵەوانی سۆز و بەزەییە.

لە ڕووەکەکانەوە تا ئاژەڵەکان و، تـا دەگاتـە مرۆڤـەکان، هـەموو دایکێك بە ناوی پـیرۆزی (ئـەلڕەحیم)ی خـودا گـۆش بـووە و، سـۆز و بەزەیی و میهرەبانییەکەیشی لەم ناوە پیرۆزەوە سەرچاوەی گرتووە، کەواتە دایکان بەم بەسـۆزیی و میهرەبانییـەیان واتـە بـە زمـانی حـاڵ دەڵێن: "ئەی (ڕەحیم)، یا الله".

گەر ئێمەش ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورەمان بەم شێوە زانی و، بەم جۆرە لێمان ڕوانین و لێکمـان دانـەوە، ئـەوا جۆرێـك پـەرستشـمان بەجێ هێناوە و، بیروباوەڕەکەمان پتەو و بەهێز کردووە.[1]

---

١- لە وتەی (بیست و چوارەم)ەوە وەرگیراوە.

# بەهای ڕاستەقینەی مرۆڤ



- "ماڵێ ئاسنی بێ! مسی بێ! ئەشیای ناومالْ ئەکڕین..." .

کڕیارە گەڕۆکەکان بە کۆڵانەکاندا دەگەڕێن و، ئاسن و، مس و، فافۆن و، هەر چییان دەستبکەوێت، بە تەرازوویەك دەیکێشن، پاشان نرخێکی لەسەر دادەنێن و لە خاوەن ماڵی دەکڕنەوە.

چ سۆپایەکی لەکارکەوتووبێت یاخود پارچە ڕاخەرێکی ڕەنگا و ڕەنگ و بەنرخبێت، ئەو هەر بە کێشان و پێوان نرخی بۆ دادەنێت، هەرچەند ئێوە پێی بڵێن: "ئەمە پارچەیەکی دەگمەنە و، دەست هەموو کەس ناکەوێت"، ئەو هەر نرخی کالآیەکی کۆنتان پێدەدات، چونکە ئەو لە جوانیی و ئەنتیکەیی و هونەر و ئەم شتانە زۆر سەر دەرناکات و، تەنها وەك پارچە کۆنەیەك دەیبینێت کە بەکەڵکی خۆی بێت.

بەڵام مرۆڤ شاکاری هونەری ناوازەی خوای میهرەبانە و، هەموو شتێکی موعجیزەیە، دەستی، قاچی، زمانی، چاوی، ئەندامەکانی هەناوی، مێشکی، دڵی، ڕۆحی.. بە کورتی سەراپای بوونی ئادەمیزاد موعجیزەیەکی خودایییە.

جگە لە خوای گەورە هیچ هێز و دەسەڵاتێکی دیکە ناتوانێت بوونەوەرێکی وا قەشەنگ و بێ وێنە بهێنێتە بوون... هەموو ناوە پیرۆزەکانی خوداش لە مرۆڤدا دەخوێندرێتەوە.

- چۆن؟

- خودا (ئەلبەصیر)ە، هەرچەندە چاو و هەستی بینینی پێ بەخشیوین، بەڵام شتانێکی بەدی هێناوە کە ئێمە ناتوانین بیانبینین و، تەنها ئەو زاتە مەزنە خۆی توانای بینیی هەموو بوونەوەرانی هەیە.

خودای گەورە (ئەلسەمیع)ە، خودای گەورە هەموو دەنگەکانی بەدی هێناوە و هەموشیان دەبیستێت و، گوێ و توانایەکی بیستنی سنوورداریشی بە مرۆڤ بەخشیووە.

خودای گەورە (ئەلعەلیم)ە، چونکە خۆی هەموو زانستەکانی خولقاندووە، ئەوەی کە ئێمە دەیزانین و ئەوەش کە نایزانین، ئەوەی کە ڕووی داوە و ئەوەیش کە ڕووی نەداوە، بوون و نەبوونی هەموو شتێك پەیوەستە بە دەسەڵاتی خۆیەوە و، تەنها زاتی موبارەکی دەیزانێت.

خودای گەورە (ئەلموحی)یە، ژیانی بەدیهێناوە و، ژیانیشی بە ئێمە بەخشیوە و، زاتی پیرۆزی خۆیشی ژیانێکی نەبڕاوەی هەیە.

خودا (ئەلجەمیل)ە و، تەنها خۆی هەموو جوانییەکانی خولقاندووە و، جوانیشی بە ئێمە بەخشیوە، زاتی مەزنی خۆشی خاوەن جوانی و قەشەنگییەکی بێ وێنەیە.

خوای گەورە چەندین ناوی پیرۆزی دیکەشی هەیە، کە مرۆڤ دەتوانێت بەم شێوەیە بیانخوێنێتەوە و لێیان تێ بگات.

ئەگەر پرشنگی ئیمان بچێتە ناخی مرۆڤەوە، ئەوا دەکرێت هونەر و جوانییەکانی ئەم جیهانەش بەهۆی ڕۆشنایی تیشکەکانی ئیمانەوە بخوێنینەوە...

مرۆڤ کاتێك لەڕێی ئیمانەوە پەیوەست دەبێت بە خوداوە، خۆی دەناسێت و دەڵێت: "من ڕەنگدانەوەی هونەری پەروەردگارم، ئەو زاتە منی بەدیهێناوە، هەر ئەویش بەخێوم دەکات و ڕۆزیم پێ دەبەخشێت و، خاوەنی جەستە و ڕۆحیشمە".

کەواتە گەر مرۆڤ خودا بناسێت و، تێبگات کە خۆیشی ڕەنگدانەوەی هونەری خودایە، ئەوا بەمە بەهای زیاد دەکات و، پلەی بەرزدەبێتەوە؛ بەڵام ئەگەر بێباوەڕی لە ناخیدا بچەسپێت، ئەوا چرای نووری ئیمان لە دڵی دەکوژێتەوە و، دڵ و دەروون و ناخی تاریك دەبێت.

مرۆڤێکـی بێباوەڕ، لەبەر ئـەوەی لـە واتـای نـاو و سـیفەتە پیرۆزەکانی خوای گـەورە تـێ ناگـات و بـاوەڕی پێیـان نییـە، بـەهای دادەبەزێت و وەك جەستەیەکی بێ هەست و بێ بایەخی لێدێت، واتـە هەروەك ئەو پارچە مسەی لێ دێت کە لە نموونەی کابرای کۆنەفرۆشدا باسمان کرد.

مسگەرێك[1] بەهۆی ئەزموون و هونەردۆستییەوە پارچـەیەك مسـی نایـاب و نەخشـێنراوی زۆر لا جـوان دەبێـت، بـەڵام کۆنـەفرۆش تـەنها کێشی پارچـەکەی لا گرنگـە و، نـەخش و نیگارەکـانی سـەر پارچـەکە بایەخێکیان بۆ ئەو نییە.

مرۆڤیش وێنەی دەسـتڕەنگینیی بەدیهێنەرەکەیـەتی، بۆیـە تـەنها بە نووری ئیمان لەوە تێدەگات کـە ئـەم بـە قـودرەت و دەسـتەڵات و موعجیزەی پەروەردگاری دروستکراوە، خۆ ئەگەر چرای ئەو نوورە لە دڵی مرۆڤدا بکوژێتـەوە و، هێشـتا ئیمـانی لـە دڵـدا نەڕوانـدبێت، ئـەوا بەهۆی تاریکی ناخ و دەروونەوە هەموو ئەو جوانییانە دەبنە شتانێکی نەبینراو و نەزاندراو.

بـەڵێ! مـرۆڤ بەتیشـکی ئیمـان پلـەی (عیلـیین) لـە بەهەشـتدا بەدەسـت دەهێنێـت، بـەڵام سـتەم و کـوفر مـرۆڤ دەهێننـە ئاسـتی (ئەسفەلە سافلین)، کە شوێنێکە لە دۆزەخدا.

---

١- مسگەر: ئەو کەسەی شمەك و کەلوپەل لە (مس) دروست دەکات.

واتـه مـرۆڤ بـه پرشـنگی ئیمـان پلـەی بـەرز و شـکۆدار بەدەسـت دەهێنێت و، شایسـتەی بەهەشـتیبوون دەبێـت، بـەڵام -بەداخـەوە- مرۆڤ به تاریکی بێباوەڕی دادەچێت بۆ نزمترین هەڵدێر و شیوەکان و، له دۆزەخدا خۆی دەبینێتەوە.

کەواته ئیمان واته بەهەشت، کوفریش واته دۆزەخ.[1]

---

١- له وتەی (وتەی بیست و سێیەم)ەوه وەرگیراوە.



## هەموو کۆشکێك خاوەنێکی هەیە

"جارێکیـــــان دوو کـــەس لـــە گـــۆمێکی گەورەدا خۆیـان دەشـۆرد و مەلـەیان دەکرد، تـا برستیان لێ بـڕا و، هێندە ماندوو بوون کە لە هۆش خۆیان چوون و بوورانەوە.

کاتـــێ لـــەو بێهۆشـــییە بێداربوونـــەوە و بـــە وردی ســـەرنجی دەوروبەریان دا بۆیان دەرکەوت کە لە جیهانەکەی خۆیاندا نـەماون و، هێنراونەتە جیهانێکی دیکەی تەواو جیاواز لە جیهانەکەی پێشوویان!

جیهانێك کـە سـەرتاپا خـۆی و سـەرجەمی شـتانی نـاوی سـەیر و سەرسوڕهێنەر بوون، چونکە ڕێکـوپێکی ئـەو جیهانـە نوێیـە ئەوەنـدە ورد و ناوازە بوو، کە دەتوت وڵاتێکی ئەوتۆیە کـە تـابڵێی بـە وردی و ڕێکوپێکی بایەخ بە گشت لایەن و گۆشـەیەکی دراوە و.. لـە جـوانی و قەشەنگیدا چەشنی شارێکی ئـاوەدان خـۆی دەنوانـد و.. ئەوەنـدەش پەیوەندیی نێوان پایەکانی ئەو جیهانە توندوتۆڵ و مەحکەم بوون، کە کوتومت لە کۆشکێکی قایم و ناوازەی نوێ دەچوو.



هەردووکیان بە تاسە و ئارەزوومەندییەوە سەیری دەوروبەری خۆیانیان دەکرد، لە ڕاستیشدا ئەو جیهانەی کە ئەوان ڕووبەڕووی بووبوونەوە هێندە مەزن بوو کە بە جارێ ئەمانی خستبووە سەرسوڕمان و گرفتاری سەرسامیی کردبوون؛ چونکە ئەگەر سەیری لایەنێکی ئەو جیهانە بکرایە ئەوا وڵاتێکی ڕێکوپێک دەبینرا و، گەر تەماشای گۆشەیەکی تری بکرایە شارێکی کامڵ دەردەکەوت و، خۆ گەر بۆ ڕوویەکی دیکەی بڕوانرایە ئەوا کۆشکێکی گەورەی وا مەزن دەبینرا کە جیهانێکی سامناکی لە ئامێز گرتبوو!

پێکەوە کەوتنە گەڕان بەناو ئەم جیهانە سەرسوڕهێنەرەدا، لە گەشت و گەڕانەکەیاندا چەند بوونەوەرێکیان دی کە بەجۆرە زمانێکی

تایبەت لەگەڵ یەکتردا دەدوان و قسەیان دەکرد، کە ئەمان لێی تێ نەدەگەیشتن، بەڵام لە ئاماژە و هێماکانیانەوە هەستیان کرد کە ئەوانە چەند کار و ئەرکێکی گەورە و گرنگ ئەنجام دەدەن.

یەکێکیان بەوی تری وت:

- بێگومان ئەم جیهانە سەرسوڕهێنەرە بەڕێوەبەرێکی هەیە، کاروبارەکانی بەڕێوە دەبات.. ئەم وڵاتە ناوازەیەش خاوەنێکی هەیە چاودێریی دەکات.. ئەم شارە ڕەنگینەش گەورەیەکی هەیە هەموو کاروباری شاری بەدەستە.. ئەم کۆشکە مەزنەش بنیاتنەرێکی بێ وێنەی هەیە کە بەم شێوە ناوازەیە دایهێناوە.

لەبەر ئەوە، من بە پێویستی دەزانم هەوڵی ناسینی بدەین، چونکە وادیارە هەر ئەوە کە ئێمەی هێناوەتە ئێرە، جا ئەگەر نەیناسین، ئەوا ئەو کات کێ -جگە لەو- دێت بەهانامانەوە و فریامان دەکەوێت و، لەم جیهانە نامۆیەدا گیروگرفتەکانمان لە کۆڵ دەکاتەوە و، پێویستییەکانمان بۆ فەراهەم دەهێنێت؟

چی لەم بوونەوەرانە چاوەڕێ بکەین، کە لە زمانیان تێناگەین و، ئەوانیش گوێ بۆ ئێمە ڕاناگرن؟.. پاشان ئەو کەسەی کە ئەم جیهانە مەزنەی لە شێوەی وڵاتێکی ڕێك و لە شێوەی شارێکی قەشەنگ و لە ڕووخساری کۆشکێکی نارازەدا بنیات ناوە و، چەشنی گەنجینەیەکی پڕ لە شتانی سەیروسەمەرە بەکاری هێناوە و، بە قەشەنگترین ئارایشت و جوانی ڕازاندوویەتەوە و، هەموو گۆشە و سووچ و

لایەنێکیشی بە چەندەها موعجیزاتی پڕ لە واتای بەرز و بڵند ئارایشت داوە.. ئەو بنیاتنەرەی کە خاوەنی ئەم هەموو شکۆمەندی و مەزنییەیە و، ئێمە و ئەم بوونەوەرانەشی هێناوەتە ئێرە.. بێگومان ئەو کەسە نیازێکی بەم کارانە هەیە و، هیچیان هەڕەمەکی و بێ مەبەست نین. کەواتە دەبێت ئێمە لە پێش هەموو شتێکدا بە باشی بیناسین، پاشان هەر لە ڕێی خۆیەوە بزانین چی لە ئێمە دەوێ و داوای چیمان لێ دەکات؟

هاوڕێکەی پێی وت:

– واز لەم قسانە بهێنە! من باوەڕ ناکەم یەکێکی تاکی تەنیا هەبێت ئەم جیهانە ناوازەیە بەڕێوە ببات!

وەڵامی دایەوە:

– کاکی هاوڕێم! لەسەرخۆ بە! کەمێ گوێم لێ ڕاگرە. گەر ئێمە ناسینی ئەو پشتگوێ بخەین، ئەوا هیچ دەستکەوتێکمان نابێت، بەڵام گەر هەر زیانێک لەو پشتگوێ خستنەدا ببێت، زیانێکی زۆر گەورە دەبێت. خۆ ئەگەر بەپێچەوانەشەوە، هەوڵ بدەین بیناسین، ئەوا دووچاری هیچ چەشنە گیروگرفتێک نابین و زیانیشمان پێ ناگات، بەڵکو گەلێ سوودی گەورە و مەزنیشمان دەستگیر دەبێت. کەواتە ئێمە کارێکی گەلێ نابەجێ و نەشیاو دەکەین گەر ئاوا بمێنینەوە و بایەخ بە ناسینی ئەو نەدەین.

بەڵام هاوڕێ بێ ئاگاکەی وتی:

– من لەم قسانەدا لەگەڵت نیم! من حەوانەوە و شادیی خۆم لەوەدا دەبینم کە هەرگیز بیر لەم شتانە نەکەمەوە و، ئەو بنیاتنەرە ناوازەیەش نەناسم کە تۆ باسی دەکەیت! پێم باش نییە کە خۆم لە شتێکدا ماندوو بکەم ژیرییم وەری ناگرێت و لێی تێ ناگەم، بەڵکو پێم وایە هەموو ئەم کارانەی دەیانبینین تێکڕا بەرهەمی (ڕێکەوت)ن و، چەند شتێکی تێهەڵکێشن و لە ڕەفتار و کاروباریشیاندا بۆ خۆیان سەربەست و سەربەخۆن! من چیم لەم شتانە داوە؟

ژیرەکەیان وەڵامی دایەوە:

– دەترسم ئەم سەرسەختیی و لاسارییەی تۆ ئێمەش و کەسانی تریش دووچاری چەندین گیروگرفت و دەردی سەری بکات! چونکە ئایا هەر لە ئەنجامی ئەم لاسارییەی کەسانێکی وەك تۆوە نەبوو کە چەندەها شاری ئاوەدانی وێران و کاول کرد؟!

جارێکی تر هاوڕێ بێ ئاگاکەی لێی ڕاپەڕی و وتی:

– با بە یەکجاری ئەم بابەتە ببڕینەوە و، ئەم باسە یەکلایی بکەینەوە. یان دەبێ بە چەشنێکی گومان نەهێڵ بۆم بسەلمێنیت کە ئەم وڵاتە خاوەن و بنیاتنەرێکی تاك و تەنیای هەیە، یاخود وازم لێ بهێنە و کارت بەسەر منەوە نەبێت.

هاوڕێکەی وەڵامی دایەوە:

– هاوڕێکەم، مادەم تۆ تا ڕادەی شێتی و وڕێنەکردن لەسەر ملنەدان و سەرسەختیی خۆت سوور و بەردەوامیت.. ئەوا منیش ئێستا بۆت دەسەلمێنم کە ئەم وڵاتە بنیاتنەرێکی ناوازە و داهێنەرێکی تاك و تەنیای هەیە، کە هەر تەنها ئەوە گشت کاروبارەکانی ئێرە دەسازێنێت و بەڕێوەیان دەبات، بە ڕادەیەك کە هەر بەچاوی خۆت هیچ ناتەواوی و نەنگییەك لە هیچ شتێکدا نابینیت. ئەو بنیاتنەرەی کە ئێمە نایبینین، ئەو ئێمەش و هەموو شتێکی تریش دەبینێت و گشت گوفتارێك دەبیستێ.. ئەو بوونەوەرانەش کە ئێمە لە زەمانیان حاڵی نەدەبووین، لەلایەن ئەو بەدیهێنەرەوە چەند ئەرکێکیان پێ سپێردراوە و، وڵاتەکە ئاوەدان دەکەنەوە..

**بەڵگەی یەکەم:**

وەرە تەماشای دەوروبەرت بکە، لەناو هەموو ئەم کارانەدا جێ دەستێکی شاراوە هەست پێ دەکرێت. بڕوانە تۆوێك کە کێشی یەك گرام نییە، دارێکی لێوە پێك دێت کە هەزاران کیلۆ کێشیەتی و، هەرچەندە هێندەی گەردێك ژیریی نییە، کەچی چ کارێکی ژیرانە ڕادەپەڕێنێت.

مەگەر وانییە؟ تۆوێکی ورد فڕێ دەدرێتە ناو خاك، پاش ماوەیەك تۆوەکە هەڵدەقڵیشێت، ڕەگ دەردەکات، دەبێتە نەمام، لەپاشان دەبێتە دارێکی گەورە و، بە سەدان کیلۆ میوە هەڵ دەگرێت.

ئەمە واتای ئەوەیە کە ئەم کارانە لە خۆوە بەڕێوە ناچن، بەڵکو هێزێکی نادیار هەیە کە بەڕێوەیان دەبات.

**بەڵگەی دووەم:**



لەو دەشت و ڕووبار و شتانە بڕوانە کە هەموو لایەکی زەوییان ڕازاندووەتەوە، هەریەکەیان ئەرکێکیان لەسەر شانە، کە نیشانەیە بۆ زاتی بەدیهێنەر، هەریەکەیان وەك مۆر و جێدەستی ئەو زاتەن، ئەها تەماشاکە لە گرامێك لۆکە چی سازدەکەن، سەیربکە چەند تۆپ قوماشی ڕەنگاوڕەنگی لێ دەردەچێت، بزانە لەو لۆکەوە چەند جۆر حەڵوا و نوقڵ و، لە ڕۆنەکەشی چی دروست دەکرێت، بەڕادەیەك ئەگەر هەزار کەس وەك من و تۆ قوماش و چنراوەکان بپۆشن و، لەو خۆراکانە بخۆن هێشتا تەواو نابێت.

مەگەر وا نییە؟ لە دەنکە تۆوێکی قەیسییەوە، لە تۆوێکی کاڵەکەوە، قەد قەد قوماش دەچندرێت.. گوڵی سوور و زەرد و سپی و ڕەنگاوڕەنگ دەپشکوێن و، دەبنە میوە و بەروبوومێکی هێندە بە تام کە لە پاقلاوە و نوقڵ شیرینترن و لە کفتە و پلاو بەتامترن، لە کۆتاییدا پێشکەشی ئێمە دەکرێن.

تەماشاکە، ئەوەتا خوای گەورە لەم خۆڵ و ئاسن و مس و زیو و ئاو و خەڵوزە هەڵ دەگرێت و پارچەیەك گۆشتیان لیّ پێك دەهێنێت.

مەگەر بەم جۆرە نییە؟

جەستەمان لە گۆشت و ئێسقان و خوێن پێکهاتووە، ئەی ئەم سیانە لەکام ماددانەوە پێك هاتوون؟

لە ١١٨ ئەتۆمەوە.

چی و چی تریشی تیایە؟

– سەرەڕای ئەو مادانەی ناومان هێنان ماددەی (ئەلەمنیۆم، قوڕقوشم، زینك، مەگنیسیۆم، سۆدیۆم، تەنەکە، گۆگرد، کلۆر، کرۆمیۆم...هتد) لە جەستەماندان.

ئەمانە لە کوێوە دێن؟

– زۆربەیان لە خاك و، بەشێکی لە ئاو و، بەشەکەی تریشی لە هەوادان.

ئەو دەستە نادیارە، چۆن دەتوانێت لە مادەی بێگیان بوونەوەری زیندوو و ژیری وەك ئێمە بەدی بهێنێت؟

– ئەی هاوڕێی بێ ئاگام! ئەم كارانە تەنها لە توانای ئەو زاتەوەن، هەرچییەك لێرەدا هەیە لە ژێر فەرمانڕەوایی ئەودان و، بەفەرمانی ئەو دەجوڵێنەوە.

## بەڵگەی سێیەم:

وەرە تەماشای ئەو بوونەوەرە ناوازانە بكە كە لە دەوروبەرماندان، هەریەكەیان هێندە جوان دروستكراون هەر دەڵێیت نموونەیەكی بچووككراوەی كۆشكی گەردوونە، چونكە لەم كۆشكەدا هەرچییەكە هەیە لەو بوونەوەرانەشدا هەیە.. جگە لە بنیاتنەری ئەم كۆشكە هیچ كەسی دیكە هێندە بەم شوێنە شارەزا نابێت و، تا وێنەیەكی كۆشكەكە لەم بوونەوەرانەیدا ببەخشێنێت؟

لەم گەردوونەدا هەرچییەك هەبێت، وێنەیەكی بچوككراوەشی لەناو مرۆڤدا هەیە، هەموو ماددەكانی دنیا ئەگەر بەرێژەیەكی كەمیش بێت لە جەستەی مرۆڤدا بوونیان هەیە.

ئەگەر دنیا كانی و ڕووباری هەیە، مرۆڤیش دەماری خوێنی هەیە، لە دنیادا سەوزایی و دارو درەخت هەیە، لە مرۆڤیشدا قژ و موو هەیە، لە دنیادا شاخ و بەرد هەیە لە مرۆڤیشدا ئێسكەكان هەن، دنیا خۆری هەیە، مرۆڤیش چاوی هەیە.. نموونەی لەم جۆرانە زۆر زۆرن.

کەواتــە هــەر ئامێرێـك كـە بـە چـاو بیبینیـت، هــەڵگری ئیمـزاو جێدەستی خوای بەدیهێنەرن و، ئەوان هەموویان بەزمانی حاڵ دەڵێن: ئێمە بەرهەمی زاتێکین کە هەر وەك چۆن ئەم دنیایەی بەدیهێناوە، بە هەمان شێوە و بگرە ئاسانتریش ئێمەی هێناوەتە بوون.[1]

١- (لەوتەی بیست و دووەمەوە وەرگیراوە).

## خودا یەکە.. بەڵام چۆن؟



"ئەگەر چەندین کەرەسە و شمەك و بابەتی بازرگانیی جۆراوجۆری کەسێکی گەورەی بەدەستەڵات هاتە ناو بازاڕێك یان شارێکەوە، ئەوا بە دوو شێوە دەزانرێت کە ئەو کەرەسانە موڵکی ئەو کەسەن:

یەکەم: بە شێوەیەکی پوخت و گشتی (واتە لای زۆرینە و عەوامی خەڵکی) بەم جۆرەیە کە: (دەزانێت جگە لەو دەستەڵاتدارە، لە توانای کەسانی تردا نییە کە خاوەنی ئەم چەشنە کاڵا و سامانە زۆر و زەبەندەیە بێت) بەڵام دەگونجێت لە گۆشەنیگای ڕوانینی ئەو مرۆڤە عەوامەوە ئەو سامانە زەوت بکرێت و کەسانێکی زۆر لافی خاوەنێتی ئەو کەرەسانە لێ بدەن.

دووەم: بە خوێندنەوەی نووسراوی سەر یەك بەیەكی دەستە و بەستەكەكانی ئەو كەرەسانە و ناسینی ئەو (مۆر) و (تەمغانە) كە لە هەموو یەكێكی كالاّ و كەرەسەكان دراون.

واتە لەم حاڵەتەدا هەموو شتێكی ئەو كەرەسانە لە ناوەڕۆكدا خاوەنەكەیان دەناسێنن.

جا هەروەك كەرەسە و بابەتە بازرگانییەكان بە دوو شێوە خاوەنەكەی خۆیان دەناسێنن، یەكتاپەرستی (تەوحید)یش وایە، واتە دوو جۆرە:

یەكەمیان: تەوحیدی ڕواڵەتیی خەڵكی سادە و ساكارە كە بریتییە لەوەی: "خوای گەورە یەكێكە و، هاوبەش و هاووێنەی نییە، ئەم بوونەوەرانەش موڵكی ئەون".

دووەمیان: تەوحیدی ڕاستەقینەیە، كە بریتییە لە: ئیمانێكی دامەزراوی پڕ لە دڵنیایی و تەواو نزیك لە شەهادەت هێنان بە یەكتایی



خوای گەورە و دەرچوونی هەموو شتێك لە دەستی توانستی ئەو خوایە و، بەوەی کە لە خوایەتیدا هاوبەشی نییە و، لە پەروەردگاریێتیدا بێ یاریدەدەرە و، لە موڵك و دەستەڵاتیشیدا هیچ دژ و نەیارێکی نییە.. ئیمانێکی ئەوتۆ کە سرەوت و حەوانەوەی هەمیشەیی بە دڵی خاوەنەکەی ببەخشێت. چونکە بە چاوی خۆی نیشانەی توانست و مۆری پەروەردگار و نەخش و نیگاری قەڵەمەکەی بەسەر هەموو شتێکەوە دەبینێت. بەم جۆرە، لە هەموو شتێکەوە پەنجەرەیەکی ڕوونی بەسەر نووری ناسینی خوای گەورەدا لێ دەکرێتەوە"[١].

هەموو ساڵێك نێرگز لە بەهاراندا بە هەمان ڕەنگ و شێوەیەوە سەرهەڵدەداتەوە، کەواتە ئەو کەسەی کە بەهار و نێرگزی هێناوەتە بوون هەر یەکە.

هەموو مرۆڤەکان یەك دەم، دوو چاو و، دوو گوێیان هەیە، کەواتە ئەو دەستەڵاتەی کە هەموو مرۆڤەکانی بەدی هێناوە یەکە.

سەرەڕای ئەوەی کە ڕووخساری هەموو مرۆڤەکان بەگشتی هەمان پێکهاتەیان هەیە، بەڵام ڕووی هیچ کامیان کتومت لە یەکێکی دیکە ناچێت، تەنانەت ئەگەر بە ڕووخسار کەمێك لەیەك بچن، ئەوا

---

١- ئەم دەقە لە وەرگێڕانەکەی مامۆستای بەڕێز (فاروق ڕەسوڵ یەحیاوە) وەرگیراوە، بڕوانە: وتەکان، مەقامی دووەمی وتەی بیست و دووەم، لا ٤١٨.

خووڕەوشت و هەست و ژیریی و هەڵسوکەوتەکانیان لەیەك ناچێت، کەواتە خولقێنەری گشت مرۆڤەکان یەکە.

هەموو شتێك، زیندوو و بێگیان، گەورە و بچووك، ئەوەی کە بووە و ئەوەش کە دەبێت هەموویان لە لایەن زاتێکی تاك و تەنهاوە هێنراونەتە بوون. ئەمەش هەروەك چۆن هیچ دێیەك دوو کوێخای نییە و، شارۆچکەی دوو قایمقامیشمان نییە و، لە شارێکدا دوو پارێزگار پێکەوە کاربەدەست نین و، لە وڵاتێکدا دوو سەرۆك کار ناگرنە دەست..

خۆ ئەگەر وابوایە، ئەوا وڵات دەشێوا و، هەموو کارەکان دەئاڵۆزا و، هەریەك لەو دوو کاربەدەستە شتێکی دەویست و هەریەکەیان کارێکی بەگونجاو دەزانی.

کەواتە ئەگەر وابێت بەدی هێنەری ئەم دنیا و گەردوونە یەکێکە، ئەگەر یەك نەبووایە هیچ ڕێکوپێکی و یاسایەکمان بەرچاو نەدەکەوت.



**پەروەردگاری تاك و تەنیا**
**لە هەمان کاتدا لە هەموو**
**جێیەکی سەر زەوییە؟**
**ئاخر ئەمە چۆن دەبێت؟**

خودای گەورە وەك ئێمە پێویستی بەوە نییە لە
شوێنێکی دیاریکراودا بێت، بەڵام لە هەموو جێگەیەکدا
هەیە، بەشکۆترین و بڵاوترینە و، لە هەموو
شتێکیشەوە نزیکە، تاك و تەنیایە و، هەموو شتێکیش
بە دەستی پیرۆزی خۆی ڕێکدەخات، بەڵام چۆن؟

## خودا چۆن لە هەموو شوێنێکدا هەیە؟

یەکەم: خودا لە کوێیە؟ لەسەر زەوییە؟ لە ئاسمانە؟ لە خوارەوەیە؟ لەسەرەوەیە؟

– ناتوانین هیچ کام لەمانە بپرسین.

– بۆچی ناتوانین؟

– چونکە ناتوانرێت جێگایەك بۆ خودای گەورە دیاری بکرێت، خودا لە هەموو شوێنێکە، بە زانستی و، بە هێز و دەستەڵاتی و، بە نووری و، بە جوانیی و، بە پێدانی ڕزق و ڕۆزیی... هتد، لە هەموو جێیەکدا بوونی هەیە.

– باشـه ڕۆشـنايى (نـوور) دەكەوێتـە كـوێى ژوورەكەمانـەوە؟ جێگەيەكى دياريكراوى هەيە؟



– نەخێر، لە هەموو جێگەيەكدايە.

– چۆن؟

– بە ڕووناكيى و، بە گـەرميى.. بـە دەركەوتنى ڕەنگەكانى ناو ژوورەكـەمان هەست بـە ڕۆشـنايى خـۆر دەكـەين، چـونكە ئەگـەر خـۆر و ڕووناكى بوونيـان نەبووايـە ئـەوا ئێمـە هـيچ ڕەنگێكمـان لەيـەكترى جيانـەدەكردەوە، كەواتـە خـۆر وەكـو بارسـتەيەك لـە دەرەوەى ژوورەكەماندايـە، بـەڵام بـە سـيفەتەكانى لـەناو ژوورەكەمانـدا بـوونى هەيە.

خواى مەزنيش وەك زاتى پيرۆزى خۆى لـە دەرەوەى گەردوونـە، بەڵام بە ميهرەبانيى و، ڕەنگدانەوەى ناو و سيفەتەكانى لە سـەرتاپاى دنيا و گەردووندا هەست بە بوونى دەكرێت.

خودا گشت گەردونى بەدى هێناوە، ئێمـەش نـاتوانين شـوێنێكى تايبەت بۆ خودا دەستنيشان بكەين.

بـۆ نموونـە: لـە كـوێى مێزێكـدا بـۆ ئـەو دارتاشـە بگـەڕێين كـە مێزەكەى دروستكردووە؟! بێگومان لە هيچ جێيەكى مێزەكەدا نييـە، ئەو وەستايە نە لە دارە و نە لە ئاسن تا خۆى لە ناو مێزەكەدا بێت.

دەی کەواتە بە چ شێوەیەك لەناو مێزەکەدایە؟ بەدڵنیاییەوە بە وەستایی، بە زانستەکەی، بە ژیریی و تواناى...

هەروەك چۆن ناشێ و ناتوانین بڵێین وەستا لەویای مێزەکەدایە، بەو جۆرەش ناتوانین بڵێین خودا لە فلآنە شوێنی ئەم گەردوونەدایە.

– باشە خودا بە چ تایبەتمەندییەکی لە گەردووندایە؟

– بە سیفەتەکانی، بە بەدیهێنانی بوونەوەران، بە ژیان بەخشینی، بە بەخشینی ڕێژە و زانست و ڕێکوپێکییەکی دیاریکراو بە هەموو شتەکان.

– ئایا لەناو تابلۆکاندا بە دوای نیگارکێشدا دەگەڕێین؟

– دیارە کە نەخێر.

کەوابێ وێنەکێش لە کوێی وێنەکەیدایە؟

نیگارکێش بە توانای نیگارکێشانی و، بە بەجوانی بەکارهێنانی ڕەنگەکان لەناو وێنەکەیدایە، بە وردبینی و بە زانست و بە ژیریی و بە ئەزموونی لە وێنەکەیدایە.. ڕوونتر بڵێین: وێنەکێش بە تواناکانی لە هەموو شوێنێکی وێنەکەیدا هەست بە بوونی دەکرێت، بەڵام بە جەستە خۆی لە دەرەوەی ئەو نیگارەیدایە.

هەر بەو شێوەیەش پەروەردگارمان بە ناو و سیفەتە پیرۆزەکانی لە هەموو جێیەکی گەردووندا بوونی هەیە، بەڵام بە زاتی پیرۆزی ڕاستەقینەی خۆی لە دەرەوەی گەردووندایە.

چونکه مەرج نییە دروستکەر و دروستکراوەکانی لە هەمان ڕەگەز و جۆر پێك هاتبن، ئەوەتا ئەوەی کە مرۆڤ دروستی دەکات لە جۆر و ڕەگەزی خۆی نییە...

## خودا لە هەموو شتێکەوە نزیکە، بەڵام هەموو شتێك لە زاتی موبارەکییەوە دوورە؟

دووەم: خوای گەورە (ولله المثل الأعلى)، کە مەزنی خاوەن کەماڵ و شکۆمەند و، (واجب الوجود) و، بەدیهێنەری هەموو بەدیهاتوویەك و، نووری هەمیشەیی و، پادشای ئەزەل و ئەبەدە.. لە نەفسی خۆت نزیکترە لێتەوە، کەچی تۆ بە چەشنێکی ڕەها دووریت لێیەوە.[1]



- چۆن؟!

- خۆر وەك ماددەیەك سەدان ملیۆن کیلۆمەتر لێمانەوە دوورە، بەڵام گەر ئاوێنەیەکی بچووك بەدەستەوە بگرین و ڕووی بکەینە خۆر، دەبینین خۆر دێتە نێو ئاوێنەکەوە.

---

١- ئەم دەقە لە وەرگێڕانەکەی مامۆستای بەڕێز (فاڕووق ڕەسووڵ یەحیاوە) وەرگێراوە، بڕوانە: وتەکان، وتەی شازدەیەم، لا ٢٧٧.

واتە ئێمە وەك دووری لە خۆرەوە زۆر دوورین، بەڵام خۆر بە ڕووناکییەکەی و بە گەرمییەکەی زۆر لێمانەوە نزیکە.

ئێمەش وەك ئەم نموونەیە، زۆر لە خوداوە دوورین، بەڵام خودا بەسۆز و میهرەبانی، بە نیعمەتەکانی، بە بەرەکەت و نووری پیرۆزی زۆر لێمانەوە نزیکە.

ئێمە وەك بەندە و ماددەیەك لە خوداوە دوورین، بەڵام ئەو بە دەسەڵاتی، بە زانستی، بە بینین و چاودێریکردنی ئێمە، بە بەخشینی ژیان و پێگەیاندنمان، لە ئێمەوە نزیکە، بە دەربڕینی قورئانی پیرۆز خودا لە شادەمارەکانمان لێمانەوە نزیکترە.

## خودا هەم تاك و تەنیایە و، هەم لە هەموو شوێنێکیشە

سێیەم: خودا لە کاتێکدا کە تاك و تەنیایە چۆن دەتوانێت لەهەموو شوێنێك بێت؟

سەرەتا با بە شتێکی ماددی نموونە بهێنینەوە، بۆ نموونە ئەگەر بچنە ژوورێکەوە کە هەر هەموو لاکانی بە ئاوێنە ڕووپۆش کرا بێت، خۆتان بە چەند کەس دەبینن؟

سەدان، هەزاران، وانییە؟ لە ناکاو خۆتت لێ دەبێت بە هەزاران، بەڵام خۆ خۆت هەر تەنها یەك کەسیت.

وێنەی ناو تەلەفزیۆنیش هەروایە، لەکاتێکدا کە لە ستۆدیۆدا تەنها یەك کەس (یا چەند کەسێك) هەیە، بەڵام لە ملیۆنان

تەلەفیزیۆنـەوە وێنەکـەی پـەخش دەبێـت و، بینـەرانیش وێنەکـە بـە تەواوی تایبەتمەندییەکانییەوە وەك ڕاستەقینەکە دەیبینین.

با لـە خـۆریش بـڕوانین، خـۆر ماددەیـەکی بینـراوە، بـەڵام لەبـەر ئەوەی تیشکی هەیە نیمچە ڕووناکییە.

ئێمە ئەگەر ئاوێنەیەك ڕووبکەینە خۆر، ئەوا لەناو ئاوێنەکەدا خۆر دەبینینەوە و، لە نزیکەوە پێی شاد دەبین.

ئەگەر خۆر عەقڵیشـی هەبوایە، ئـەوا وەك چـۆن ڕووناکیمـان پـێ دەبەخشێت، بەو جۆرەش دەیزانی قسەمان لەگەڵدا بکات...

هـیچ جیاوازییـەك نییـە لـە نێـوان ئـەوەی کـە لەیـەك ئاوێنـەوە تەماشای خۆر بکرێت، یاخود لـە هـەزاران ئاوێنـەوە، چـونکە خـۆر لـە بنەڕەتدا یەکە.

ئەی چۆن بوو بە هەزاران دانە؟

– ئەو خۆرە بە جەستە نا، بەڵکو بە ڕووناکی و بە گەرمییەکـەی، بە هەستپێکردنی لە لایەن هەموو بوونەوەرانەوە دەبێـت بـە ئەوەنـدە پارچە.

هەر وەك چـۆن خـۆری دروسـتکراوی خـوای گـەورە لەیـەك کاتـدا بـەهۆی سـیفەتەکانی و بـە هـۆی بینینـەوە دەبێتـە ملیۆنـەها دانـە.. خوداش لـە کاتێکـدا یەکـە، بـەڵام لـە هـەموو شـوێنێك هەیـە، خـودای گەورە بە ناو و سیفەتە پیرۆزەکانی لە گشت جێگەیەکدا هەیە.

بۆ نموونە، یەکێك لە ناوەکانی خودا (ئەلڕەزاق)ە، ئەو کەسەی کە ڕۆزیدەرە، وەك ڕۆزیدەرێك تاکە، بەڵام دەبینین هەموو مرۆڤ و ئاژەڵان و ڕووەکەکان و بوونەوەرەکانی کە خودا ڕزق و ڕۆزیان دەدات ڕەنگدانەوەی ناوی (ئەلڕەزاق)ن.

ناوی پیرۆزی (ئەلڕەزاق) یەکێکە، بەڵام بە ژمارەی هەموو بوونەوەرانی کە پێویستیان بە ڕزقی خودایە ناوی (ئەلڕەزاق) لای هەموویان هەیە.

- بە چی؟

- بە ڕۆزیدانی، بە دابینکردنی پێداویستییەکانیان، بە بەخێوکردنیان...



با بیر له فریشته‌كان بكه‌ینه‌وه، فریشـته‌كان لـه ڕووناكی (نـوور) دروسـتكراون، بوونـه‌وه‌رانێكی خـاوه‌ن زانسـت و زانیـاریی و نـوورن، ئێمه‌ش ناتوانین ئه‌و نووره ببینین كـه فریشـته‌كانی لـێ دروسـتبوون، هه‌ر وه‌ك چۆن ڕۆح و ژیان و ژیریی خۆمان نابینین...

خـوای گـه‌وره (جوبره‌ئیـل)ی پێشـه‌وای فریشـته‌كانی بـۆ ئـه‌وه به‌دیهێناوه تا فه‌رمان و په‌یامه‌كه‌ی به پێغه‌مبه‌ره‌كانی بگه‌یه‌نێت.

بۆ نموونه له كاتێكدا (جوبره‌ئیل) بۆ خۆی یه‌ك بوونه‌وه‌ره، به‌ڵام له‌یه‌ك كاتدا له باره‌گـای خودایـه و، لـه لای پێغه‌مبه‌رمانـه ﷺ و، لـه به‌هه‌شتدایه.. هه‌رله‌وكاته‌شدا له هه‌زاران جێگه‌ی دیكه‌دایه و فـه‌رمانی خـودا جێبـه‌جێ ده‌كـات، هـیچ كارێـك كـه پێـی هه‌ڵده‌سـتێت نابێتـه به‌ربه‌رست له‌به‌رده‌م كارێكی دیكه‌دا.

(جوبره‌ئیل) وه‌ك بوونه‌وه‌رێك یه‌كه، به‌ڵام له‌یه‌ك كاتدا ده‌توانێـت له هه‌زاران شوێن بێت و هه‌زاران كار ئه‌نجام بدات.

خـوای گـه‌وره‌ش مـه‌زنترینی مه‌زنه‌كانـه و، هـه‌موو بوونـه‌وه‌رانی به‌دیهێناوه.

هه‌موو ئه‌و بوونه‌وه‌رانه‌ی كه ده‌بینرێن و، ئه‌وانـه‌ش كـه نـابینرێن و، بوونه‌وه‌رێكی وه‌ك مـرۆڤ لـه مـادده دروست بـوو و، بوونـه‌وه‌رێكی وه‌ك فریشته له نوور دروسـت بـوو و... هتـد، ئه‌مانـه هـه‌موویان وه‌ك بوونـــه‌وه‌ر یـــه‌كن، بـــه‌ڵام لـــه هـــه‌مان كاتـــدا بـــه‌هۆی چـــه‌ند تایبه‌تمه‌ندییه‌كه‌وه له چه‌ند شوێنێكی جیاواز ئاماده ده‌بن.

– باشه ئەمە چۆن؟! خوای گەورەی تاك و تەنیا، چۆن دەشێت لە چەند شوێنێك بێت؟ ئەمە دژ بە عەقڵ و ژیریی نییە؟

– بێگومان خودا تاك و تەنیایە، بەڵام خۆشەویستی لە دڵی گشت بڕواداراندا هەیە.

خودا یەکە، بەڵام ملیارەها ئەستێرە بە نووری ئەو زاتەوە دەدرەوشێنەوە، کەواتە بە ژمارەی ئەستێرەکان گەورەیی ناوی (ئەلنوور) دەردەکەوێت.

خودا یەکە، بەڵام ملیارەها گوڵی ڕەنگاوڕەنگی بەدیهێناوە، کەواتە بە ژمارەی گوڵەکان گەورەیی ناوی (ئەلجەمیل) دەدرەوشێتەوە.

خودا یەکە، بەڵام پاشماوە و ئاسەوار و جێ دەستی پیرۆزی لەسەر هەموو بوونەوەران دەبینرێت، کەواتە بە ژمارەی بوونەوەران مەزنیی ناوی پیرۆزی (ئەلخالق) دەردەکەوێت.

بە کورتی، ئەو زاتە یەکە و، بە ئەندازەی گەورەیی و درەوشاوەیی ناوە پیرۆزەکانی لەهەموو شوێنێکدا هەیە.[1]

---

١– لە وتەی (شانزەیەم)ەوە وەرگیراوە.

## کێ لە توانایدایە لەیەك شتەوە

## هەموو شتێك دروست بكات؟



"ئەو زاتەی کە لە شتێکەوە هەموو شتێك دروست دەکات، تەنها ئەو بەدیهێنەرەیە کە لە هەموو شتێکیشەوە یەك شت دروست دەکات، چونکە هەموو شتەکان پەیوەندییان پێکەوە هەیە".

– ئەمە واتای چی؟ چۆن دەبێت؟ ئایا مرۆڤ دەتوانێت کارێکی وا بکات؟

– بەڵێ دەتوانێت، بەڵام تواناکەی سنووردارە، واتە دەتوانێت لە چەند شتێکەوە شتێك دروست بکات، بەڵام ناتوانێت لە هەموو شتێکەوە یەك شت دروست بکات، چونکە تەنها ژیریی و توانا و دەستەڵاتی مرۆڤ بۆ کارێکی لەم چەشنە بەس نییە...

بۆ نموونە، دەتوانرێت تەنها لە نەوتی ڕەشەوە سەدەها مادده دروست بکرێت، چونکە نەوتی ڕەش کەرەستەی خاوی زۆرێك لەو

کەلوپەلانەیە کە بەکاریان دەهێنین، بەڵام خۆ گەر تەواوی مرۆڤایەتی هەموو ماددەکانی دنیا بهێنن ناتوانن یەک لیتر نەوتی خاوی لێ دروست بکەن.

بەڵام خوای گەورە لە تاکە شتێکەوە هەموو شتێك دروستدەکات و، مرۆڤ لە یەك دڵۆپە ئاوەوە دروست دەکات، واتە پەروەردگار لە دڵۆپە ئاوێکەوە مرۆڤێکی تەواو بەدی دەهێنێت، کە لە هێلکەیەکی دایك و تۆوێکی باوکەوە سەرچاوەی گرتووە.

گۆشت و، ئێسك و، قژ و موو و، نینۆك و، خوێن و، پێست و هەموو لەشی مرۆڤەکان لەیەك شتەوە دروست دەکات، واتە سەرەتای هەموو ئەندامێك دڵۆپێك شلە بووە...

– تەنها مرۆڤەکان بەو چەشنەن؟



– نەخێر، بەڵکو هەموو ئاژەڵەکانیش بەو جۆرەن، سەرەتای دروستبوونی ئەوانیش بە تۆزقاڵە ئاوێکی سادە دەستپێدەکات.

بەدیهێنانی هەموو ئاژەڵە شیردەرەکان، وەك مێیەی شێر و مەڕ و بزن و پشیلە و ...هتد، نیشانەیە بۆ ماددەیەکی زۆر ناوازە.

بەشێکی دیکەی ئاژەڵەکانیش لە ڕێی هێلکەوە زۆر دەبن، لە هەزاران جۆری هێلکەی گەورە و بچووک و، سپی و بۆردا هەزاران جۆر ئاژەڵ دێنە دنیاوە، واتە هەموو ئەم ئاژەڵانەش سەرەتایان هێلکەیە و، یەک سەرچاوەیان هەیە.

دروستکردنی هەزاران جۆر ئاژەڵ تەنها لە هێلکەیەکەوە، تەنها لە توانا و دەستەڵاتی خوادایە.

ڕووەکەکانیش بەهەمان شێوەن، پێکهاتەی سەرەکی هەموویان تۆوێکە، پێکهاتەی کیمیاوی هەموو تۆوەکانیش وەک یەکە و، تەنها ڕیزبەندی و شێوەیان جیاوازە.

بۆ نموونە، لە تۆوی قۆخێك بڕوانن:

ڕەگ و قەد و پەل و گەڵا و گوڵ و میوە و هەموو شتەکانی ئەو ڕووەکە تەنها لەیەك دەنکۆڵە تۆوە دروست دەبێت.

– گڵ و خۆڵ دەتوانێت قۆخ دروستبکات؟

– نەخێر، چونکە بێ عەقڵە، زانست و ژیریی و پێداویستییەکانی نییە، کارگەیەکی نییە، کۆمپیوتەرێکی نییە.. نیەتی و ناشیبێت...

خاکێکی هێندە دەستەوسان چۆن دەتوانێت قۆخێکی بەتام و شیرینیمان بۆ دروستبکات؟

دەتوانین لەم باباتەدا باسەکە بە چەندین نموونەی لەژمارەنەهاتووی دیکە دەوڵەمەند بکەین.

بـەڵێ، کەسـێك هەیـە کـە لەتاکـە شـتێکەوە هــەموو شـتێك دروستدەکات و، ئەم میکانیزمـەی بەڕێوەچوونی گـەردوونیش هـەموو سـاڵێك و هــەموو ڕۆژێـك و هــەموو سـاتێك دووبـارە دەکاتــەوە و، بـێ وەستان و پەککەوتن بەردەوامیی پێ دەدات.

## ئەی کێ لە هەموو شتێکەوە تاکە شتێك دروستدەکات؟

- چۆن؟

کە لەدەوری سفرە دادەنیشین، خواردنی خۆشخۆش دەخۆین، لـە بەروبومی ڕووەکـی و، ئـاژەڵیی وەك: گۆشـت و، ماسـی و، مریشـك و، هێلکە و، شیر و، ماست و، تەماتە و، پەتاتـە و، باینجـان و، بیبـەر و، کولەکـە و، سـێو و، پرتــەقاڵ و، مـۆز و، هــەنار و، هــەرمێ و چـی و چیتریش...

لەو خۆراکەوە کە دەیخۆین و، ڕەوانەی گەدەمانی دەکەین، تەنها یەك شت دروستدەبێت، ئەویش جەستەمانە. ئەم دروست بـوونی یـەك شتە لە هەموو شتێکەوە تەنها بۆ جەستەی مرۆڤیش نییە.

ئەوەتا گەر تۆوی سەدان جۆر گوڵی جیاواز بهاوینە خـاکی پارچـە زەوییەکەوە، ئەوا خاکەکە بێ ئەوەی تێکەڵاویان بکـات، هـەر تـۆوە و بەتایبەتمەندی خۆی سەوز دەکات.

هەنگوینیش هەروایە، هەنگێك دێت و لە سەدان گوڵ هەڵاڵە دەمژێت و دەیباتەوە شانەکەی و، لە هەموویان هەنگوین بەرهەم دێنێت.

ئاخر هەنگێکی بچکۆلە چۆن دەتوانێت هەنگوین دروستبکات؟!

کەواتە یەکێك هەیە کە لە هەموو شتەکانەوە شتێك بەو هەنگانە دروست دەکات.. واتە ئەم هەنگانە هەر ئەوەندە فەرمانیان وەرگرت، ئیتر یەکسەر دەستبەکار دەبن و، ئەو هەنگوینە بەرهەم دێنن، کە ئێمەی ژیر هەرگیز ناتوانین دروستی بکەین.



کەواتە ئێستە تێ گەیشتن کە: ئەو زاتەی لە شتێکەوە هەموو شتێك دروست دەکات، هەر تەنها ئەویشە کە لە هەموو شتێکەوە تەنیا شتێك دەسازێنێت.[1]

---

١- لە وتەی (بیست و دووەم)ەوە وەرگیراوە.



## ئەو پیتەی
## کە باس لە خۆی و
## نووسەرەکەشی دەکات

"هەر پیتێکی ناو کتێب، سەرەتا خۆی وەك پیتێك بوونی هەیە، پاشان لە پێکهێنانی دەیان وشەدا بەشدار دەبێت، ئەوجا گوزارشت لە نووسەرەکەی دەکات بە هەموو وەسفەکانییەوە".

– پیتی (لام) تا چەندێك پێناسەی خۆی دەکات و باس لە خۆی دەکات؟

– تەنها بە ئەندازی خۆی.

– چۆن؟

– کە دەنگی /ل/ لە زار دەردەچێت، ئیتر تەواو، تەنها وێنەی لام (ل) دێت بەخەیاڵماندا، چونکە دەنگی/ل/ جگە لەو وێنەیە بە هیچ شێوەیەکی تر نانووسرێت.



بەڵام ئەگەر بمانەوێت باس لە سیفەتەکانی ئەو کەسە بکەین، کە ئەو پیتی (ل)ەیەی نووسیوە ڕەنگە بە دەیان و سەدان وشەمان پێویست بێت.

سەرەتا باس لە قەڵەمەکەی دەکەین، وا قەڵەمەکەی جاف بوو و، مەرەکەبەکەی ڕەش بوو و، نووکەکەی باریك بوو و، قەڵەمێکی بەسوود بوو.. هتد.

خۆ ئەگەر بێینە سەر وەسفی نووسەرەکەی، تەماشا کەن دەتوانین چەندێك دەربارەی بنووسین:

سەرەتا ئەم کەسە دەستی هەیە کە قەڵەم و شتی پێدەگرێت، چاوی هەیە پێی دەبینێت، گوێی هەیە شت دەبیستێت، خوێندنەوە و نووسین دەزانێت، ژیرییەکی تەواوی هەیە، پەروەردە کراوە، کەسێکی زانا و بەئابڕووە.. سەرەڕای چەندین وەسفی دیکەش.

با بیر لە سێوێك بکەینەوە، هەر کە دەڵێیت (سێو)، بەرامبەرەکەت تێ دەگات مەبەستت لە چیە، ئەگەر یەکێکیش بپرسێت: "سێوی کوێ؟"، بۆ نموونە دەڵێیت: "سێوی ئاماسیا"، بەمەش پرسیارکەرەکە بەتەواوی دەزانێت مەبەستت لە کام جۆرە سێوەیە.

بەڵام ئەگەر بمانەوێت باسی دروستکەر و بەدیهێنەری ئەو سێوە بکەین، ئەوا پێویستە چەندێك لەبارەیەوە بنووسین؟

لە ڕاستیدا گەر چەندین پەرتووکیشی لەسەر بنووسین، هەر لە باسکردنی تەواو نابین.

گەر دەتانەوێت با هەوڵبدەین چەند ڕستەیەك بڵێین:

ئەوەی سێوی دروستکردووە، درەخت نییە، چونکە دار و درەخت توانای کارێکی وایان نییە، خاکیش نییە، چونکە ئەو خۆڵ و گڵە هێندە بەتوانا و لێوەشاوە نییە کە بتوانێت سێو دروست بکات، کەواتە ئەو زاتەی کە سێوی دروستکردووە، لە ڕەگەز و جۆری مرۆڤ و دار و گڵ نییە، بەڵکو ئەو دەسەڵاتدارەیە کە درەخت و خاك و مرۆڤیشی بەدی هێناوە و، زاتی موبارەکی لە جۆری دروستکراوەکانی نییە و، ئەو زاتەش خوای گەورەیە کە هەموو مرۆڤێکی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون.

بەدیهێنەری سێو یەکێکە، چونکە ئەو جیهانەی کە سێوی تیایە یەکە، ئەو خۆرەش کە سێو پێدەگەیەنێت هەر یەکە، هەموو سێوێکی سەر ئەم زەمینە یەك دەست بەرهەمیان دەهێنێت، هەموویان لەیەك کارگەدا دروست دەبن.

توانا و دەستەڵاتی دروستکەری سێو ڕەهایە، ئەو (ئەلقادر)ە، چونکە ئەو هێزەی کە سێوی دروستکرد هەمان ئەو هێزەیە کە دنیا و خۆر و گەلە ئەستێرەکان و گەردوونی دروستکردووە، کەواتە بۆ ئەوەی سێوێك دروستبێت پێویستە گشت ئەم گەردوونە بوونی هەبێت، چونکە گەردوون و بوونەوەران هەموویان پێکەوە بەستراون و پەیوەندییان پێکەوە هەیە.



دروســــتکەری ســــێو خــاوەن زانسـتێکی ڕەهایـە، یــەکێك لـــە ناوەکانیشـــی (ئەلعـەلیم)ە، چـونکە ئـەو زاتــــەی کــــە ســــێوی دروسـتکردووە هـەم گشـت سیفەت و تایبەتمەندییەکانی ســێو دەزانێــت و، هـــەم جیاوازی دارسێو لەگەڵ دارەکانی دیکەدا دەزانێت.

جگە لەوەش گشت تایبەتمەندییەکانی ئەو مرۆڤەش دەزانێت کە ئەو سێوە دەخوات، بە کـورتی هـەر شـتێك کـە بـوونی هـەبێت، ئێمـە بیزانین یان نەیزانین یاخود هەر نەشتوانین فێری ببین، ئەو زاتـە پێـی شارەزایە و زانایە پێیان.

ناوێکی دیکەی دروستکەری سێو (ئەلبەصیر)ە، کە سێو و هەموو مرۆڤەکان و هەموو بوونەوەران و هەموو گەردوون دەبینێت، چونکە لە گەردووندا هەموو شتەکان پەیوەندییان پێکەوە هەیە.

دروستکەری سێو جوانە و، یەکێك لە ناوەکانی (ئەلجەمیل)ە، کـە سەرچاوەی جوانیی سێو و، جـوانیی مـرۆڤ و، جـوانیی دنیـا و، گشـت جوانییەکانی گەردوونە و، بۆ ئەوەی سێو جوان بێـت پێویسـتە گشـت ئەم شتانەش جوان بن.

دەتوانین لە زۆر ناو و سیفەتی دیکەی خوای گەورەش تێ بگەین کە هاوشێوەی ئەمانەن، هەرچەندە ناو و فەرمایشتەکانی پەروەردگار بە ژماردن و نووسین تەواو نابن.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت: ﴿قُل لَّو كَانَ البَحْرُ مِدَاداً لِّكَلِمَـتِ رَبِّي لَنَفِدَ البَحْرُ قَبْلَ أَنْ تَنْفَدَ كَلِمَـتُ رَبِّي وَلَو جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَداً﴾ الكهف: ١٠٩، واتە: (تۆ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ئەگەر دەریا مەرەکەب بێ بۆ نووسینی کەلیمەکانی زانیاری و دەسەڵات و توانی خودا، دەریا تەواو ئەبێ پێش ئەوەی کەلیمەکانی خودا تەواو ببن، هەرچەند ئەوەندەی ئەو دەریایە دەریای تریش بێنین بۆ یارمەتی دانی، چونکە کەلیمەی خودا سنووری نییە و تەواو نابێ و وەك زاتی خۆی قەدیمە لە ئەزەلەوە بووە و تا ئەبەد ئەمێنێ، بەڵام دەریا سنووردارە و شتی سنوورداریش ئەبڕێتەوە)[١][٢].

---

١- تەفسیری ئایەتەکان لە (خولاصەی تەفسیری نامی)یەوە وەرگیراوە.

٢- لە وتەی (بیست و دووەم)ەوە وەرگیراوە.

# لەپاش مردن

# چۆن زیندوو دەبینەوە؟



لە مەحشەردا ڕۆح دەگەڕێتەوە ناو لاشە، واتە هەم لاشە دروست دەکرێتەوە، هەم سەر لەنوێ زیندوو دەکرێتەوە.

ئەم ڕستەیە واتە: مرۆڤ لە پاش مردنی دووبارە زیندوو دەکرێتەوە.

**ئەم ڕووداوەش بە سێ قۆناغ دەبێت:**

**یەکەم: ڕۆح دەگەڕێتەوە ناو جەستە.**

**دووەم: جەستەمان دووبارە زیندوو دەکرێتەوە.**

**سێیەم: لاشەمان سەرلەنوێ دروستدەکرێتەوە.**

**(حەشـــر) وشـــەیەکی عەرەبییـــە و، واتـــە زیندووبوونـــەوە و کۆکردنەوەی مرۆڤەکان لە پاش مردن.**

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەمە سوپایەك دەکەین بە نموونە.. لە هەموو لایەکی وڵاتەوە گەنجەکان دێنە نێو ئەم سوپایەوە و دەبن بە سەرباز، پاشان فێری ڕێوشوێنی سەربازی دەکرێن.. بەم شێوەیە لە ژێر فەرمانی فەرماندەیەکدا ئەرکەکانیان بەجێدەهێنن.

فەرماندەکە سەربازەکان کۆدەکاتەوە و چەند وانەیەکی سەربازییان پێدەڵێتەوە، پاشان ماوەیەك پشوویان دەداتێ و، دوای ئەوە فیکەیەك لێ دەدات و سەربازەکان دەچنەوە جێی خۆیان و دەست دەکەنەوە بە ئەنجامدانی ئەرکەکانیان.

– باشە لە سەرەتاوە کۆکردنەوە و فێرکردنی سەربازەکان زەحمەتترە، یاخود پاش فێرکردنیان و پشوو وەرگرتنیان فیکەیەك لێبدرێت و هەر سەربازە و بگەڕێتەوە سەر ئەرکی خۆی؟

– دەی دیارە کە دووەمیان ئاسانترە و سادەترە.



مـردن و زینـدوو بوونـەوەی ئێمـەش هـەر بەهـەمان شـێوەیە، پەروەردگارمان ئێمەی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون، لاشەمان نزیکەی زیاد لە چەندین (تریلیۆن) خانە پێکهاتووە، ئەگەر بڵێین هەر خانەیەك وەك سەربازێك وایە، ئەوا دەبینین پەروەردگارمان گشت ئـەم هـەموو سەربازە خانانەی لە نەبوون و هیچەوە بەدی هێناوە و لاشەی ئێمـەی پێکهێناوە.. پاش تەواوبوونی ڕۆژەکانی تەمـەنمان و مردنمـان، گشـت خانەکانمان شی دەبنەوە و، هەر خانە بەشوێنێکدا بڵاو دەبێتەوە.

هـەر کـات خـوای گـەورە ویسـتی لەسـەر دروسـتکردنەوەی ئێمـە دەبێت، فـەرمان دەکـات بـە فریشتەی بەرپرس لـەم کـارە بـە نـاوی (ئیسرافیل)، فریشتەکەش فوو دەکات بە بوقەی بە (صور) ناسـراودا، لەو کاتەدا یەکسەر خانەکانمان کۆدەبنەوە و، دێنەوە پـاڵ یـەکتری.. بەم شێوەیە سەرلەنوێ جەستەمان دروست دەبێتەوە، ئەم کـردارەش

بە هەزاران جار ئاسانتر و زووتر ڕوودەدات لە کۆبوونەوەی ئەو سەربازانەی کە لە پشوودا بوون.

لە پاشان ڕۆحیشمان دەگەڕێتەوە بۆ لاشەمان و، ئیتر بۆ هەتا هەتایە لەناو جەستەدا دەمێنێتەوە و، لە دوای ئەو ڕووداوەوە مردن جارێکی تر بەرۆکمان ناگرێتەوە.

## سەرلەنوێ زیندووبوونەوەی جەستە!

شارێکی گەورە بێگومان سەدان هەزار گلۆپی تیدایە، ئاشکراشە بەگشتی هەموو شارەکە لە یەك سەرچاوەوە کارەبای بۆ دابین دەکرێت.. بە دەستنان بە یەك دوگمەدا هەموو گلۆپەکان دادەگیرسێن و، لە چاوتروکانێکدا شار ڕووناکدەبێتەوە، هەر بەو سانایی و ئاسانییە!

واتە گەر وا دابنێین سەرجەم گلۆپەکانی دنیا بەیەك دوگمە هەڵدەکرێن، ئەوا هەر کە دەست دەنێیت بە دوگمەکەدا دنیا دەبێت بە چراخان و وەك ڕۆژ ڕووناك دەبێتەوە.

وزەی کارەبا نیعمەتێکی پەروەردگارمانە، کە مرۆڤەکان بەهۆیەوە چەندین کار ئەنجامدەدەن.

هەروەك ئەم نموونەیەی سەرەوە، خودای مەزن دەتوانێت لەیەك کاتدا بە فەرمانێك جەستەمان دروستبکاتەوە، هەر لە هەمان کاتدا دەتوانێت ڕۆح بکاتەوە بەبەر لاشەماندا، بەس تەنها لاشەی ئێمەش

نا، بەڵکو دەتوانێت لەیەك کاتدا بە فەرمانێك ڕۆح بکاتەوە بە لاشەی گشت مرۆڤەکاندا.

هەروەکو خودای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا ڕوونی کردووەتەوە کە دەفەرموێت: ﴿.. وَمَا أَمْرُ السَّاعَةِ إِلاَّ كَلَمْحِ البَصَرِ.. ﴾ النحل:٧٧، واتە: (ڕوودانی ڕۆژی قیامەت لای خودا وەك چاو بەیەکادانێکە (چاوتروکاندنێکە) یا لەوەیش کەمترە).

چەندین نموونەی دیکەشمان هەیە کە بەڵگەن لەسەر ئەم زیندووبوونەوەی پاش مردنە.

کاتێك وەرزی بەهار دێت ملیارەها درەختی وشکەوەبوو زیندوو و سەوز دەبنەوە و، گوڵ دەکەن و، میوە و بەری بەتام و ڕەنگاوڕەنگ دەگرن، کۆمەڵێك درەختیش هەرچەندە لەم وەرزەدا سەوز دەبنەوە بەڵام لە وەرزی هاویندا بەرەکەیان پێ دەگات.

تۆوە شاردراوەکانی ژێر خاك و خۆڵ دەژێنەوە و چەکەرە دەکەن.. بە هەمان وێنەی بەهاری ساڵی پێشووتر سەوز دەبن و زەوی دەڕازێننەوە.

ڕۆژانە، زیندووبوونەوەی دوای مردن (واتە حەشر) بە چەندین نموونە و شێوەی جۆراوجۆر دەبینین.

ئایا بەدیهێنەرێك کە لە زستاندا دار و درەخت و مار و مێروو و زیندەوەرە سادە و بێ عەقڵەکان بمرێنێت و، سەرلەنوێ لە بەهاردا

زیندووییان بکاتەوە، ناتوانێت بوونەوەرێکی وەك (مرۆڤ)یش لە دوای مردنی سەرلەنوێ زیندووبکاتەوە؟

یاخود، ئایا زیندووکردنەوە کارێکی قورس و گرانە بۆ زاتێکی هێندە باڵادەست؟!

بەپێی یاساکانی دنیا زیندووبوونەوەی بوونەوەرەکانی سەر زەوی چەند هەفتەیەك دەخایەنێت، بەڵام بەپێی یاساکانی قیامەت لە چاوتروکانێکدا ڕوو دەدات، چونکە لەوێ هەموو شتێك لەیەك کات و چاوتروکانێکدا ڕوودەدات.[1]

---

١- لە وتەی (دەیەم)ەوە وەرگیراوە.



# مردووەکان چۆن زیندوو دەکرێنەوە؟

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَانْظُرْ إِلى أَثَـرِ رَحْمَتِ اللهِ كيفَ يُحْيِ الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِـهَا إِنَّ ذلِكَ لَمُحيِّ الموتى وَهُـوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَـدِيرُ﴾ الروم:٥٠، واتە: (جا بڕوانە بۆ نیشانە و قـازانجی ڕەحمـەتی خـوا چـۆن زەوی بەو بارانـە زینـدوو ئەکاتـەوە و پـاش وشـک بوونـەوە و مردنـی. بەڕاسـتی ئـەو خوایـە کـە وا زەوی بـەوجۆرە زینـدوو ئەکاتـەوە، ئـەو خوایەیـە کـە مـردووان زینـدوو ئەکاتـەوە و، ئـەو خوایـە دەسـتەڵاتی بەسەر هەموو شتێکا ئەشکێ).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَضَرَبَ لَنَا مَثَلاً وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحِي العِظَامَ وَهُوَ رَمِيم* قُلْ يُحيِيهَا الّذِي أَنْـشَأَهَا أَوّلَ مَـرَّةٍ وَهُـوَ بِكُـلِّ خَلْـقٍ عَلِـيم﴾ يس: ٧٨-٧٩، واتـە: (کـابرای خوانـەناس ئێسـقانێکی ڕزیوی بە نموونە بۆ هێنایەوە کـە گوایـە مـردوو زینـدوو ناکرێتـەوە و دروسـتکردنی خـۆیی لەیادچـوو کـە چـۆن لـە دڵۆپێ ئـاو دروسـتمان کردووە. وتی: کێ ئێسقانی ڕزیو زیندوو ئەکاتەوە؟ مەبەستی ئەوەبوو کەس ناتوانێ زیندووی بکاتەوە* تۆیش، ئەی موحەممەد، لە وەڵامیا

بلێ: ئەو کەسە زیندووی ئەکاتەوە کە یەکەمجار دروستی کردووە کە خوایە و ئاگای لە هەموو شتێکیش هەیە و، ئەزانێ مرۆ کە مرد چی لێ دێ و، کە ڕزیی خۆڵەکەی ئەبێ بەچی و ئەکەوێتە کوێ و چۆن کۆئەکرێتەوە و ئەخرێتەوە پاڵ یەک و، بنیادەمەکەی جارانی لێ دروست ئەکرێتەوە).

کەواتە ئەو خوایەی کە سەرزەوی لە پاش مردن و وشکبوونەوەی زیندوودەکاتەوە و، چەندەها بوونەوەریشی لەگەڵدا زیندوو دەکاتەوە، بێگومان ئەو زاتە هێز و دەستەڵاتی ئەوەی هەیە کە مرۆڤیش هاوشێوەی ئەوان دووبارە زیندوو بکاتەوە.

لەگەڵ هاتنی وەرزی پایزدا گەڵای درەختەکان زەرد دەبن، ڕووەکەکان وشکدەبن، مار و مێروو و هەنگ و پەپوولەکان کەم دەبنەوە، زۆربەی باڵندەکان دیار نامێنن، ڕووی زەوی لە سەوزەوە دەبێت بە زەرد.



کاتێک وەرزی زستان دادێت و، کەش و هەوا سارد دەبێت و، بەفریش دەست دەکات بە بارین، گەڵای

درەختەکان هەمووی دەوەرێت، گژوگیاش لە زەوی دەبڕێت.. نە مێروویەك دەبینیت نە مێشوولەیەك، نە هەنگێك نە باڵندەیەك، نە هەرکام لەو گیانلەبەرانەی کە دەمەو بەهار دەتبینین...

- باشە ئەمانە ئەچن بۆ کوێ؟ ئایا نامرن؟ درەختەکان هەرچەندە گەڵاکانیان هەڵ دەوەرێت، بەڵام خۆ هەر دەیانبینین و ون نابن، کەچی ئەم گیانلەبەرە بچووکانە هیچ ئاسەوارێکیان نامێنێت، ئێوە ئەڵێن بۆ کوێ دەڕۆن؟

تەنها وەڵام بۆ ئەم پرسیارە ئەوەیە: "لەکوێوە هاتوون، هەر بۆ ئەوێ دەگەڕێنەوە".

لەگەڵ هاتنی زستاندا کەمێك دڵمان تەنگ دەبێت بە سەرماوسۆڵە و دیارنەمانی مێروو و هەنگ و پەپوولەکان، بەڵام دەڵێین: "هەرچۆنێك بێت لەگەڵ هاتنی بەهاردا ئەوانیش سەر دەردێننەوە"، ئیتر بەمە ئاسوودە دەبین و، دڵمان خۆش دەبێت.

هیچ گومانێکمان نییە لەوەی پاش ئەم زستانە وەرزی بەهار دێتەوە، چونکە وا ڕاهاتووین هەموو ساڵێك لە پاش وەرزی زستان بەهار بێتەوە.

دەمەو پایز گژوگیا و گوڵەکان و درەختەکان خامۆش دەبن و دەنوون، بەڵام هەموو تایبەتمەندییەکانیان لەناو تۆوەکانیاندا بەجوانی دەپارێزن...

بەم شێوەیە تۆوەکان چاوەڕێی هاتنی بەهار دەکەن، بۆ ئەوەی سەرلەنوێ زیندوو ببنەوە.

گوڵاڵەسوورە و وەنەوشە و کاشمەی ساڵی پێشووتر چۆن بووبێت، هی ئەمساڵیش هەر بەهەمان شێوەیە، واتە وەکو ساڵی پار بە ڕەنگ و بۆن و شێوەیان دڵخۆش دەبین.

تۆوی کاڵەك و شووتیش هەر وەك کاڵەك و شووتی دێنە بەرهەم، گڵ و خۆڵەکە هیچ کام لە تۆوەکان لەگەڵ تۆوێکی دیکەدا تێکەڵاو ناکات، ئەو فەرمانەی پێی دراوە بێ لێ تێکچوون ئەنجامی دەدات!

– ئەی مێرووەکان و هەنگەکان و باڵندەکان؟ ئەوانیش هەموو ساڵێك سەر لە نوێ دروست دەکرێنەوە؟ باشە کێ هەموو ئەمانە دروست دەکاتەوە؟

– دیارە هەر ئەو زاتەی کە یەکەمجار دروستی کردوون دەتوانێت ئەم کارە بکات، مرۆڤەکانیش بە هەمان شێوەن، هەر کە بەخاك دەسپێردرێن، چاوەڕێی بەرەبەیانی ڕۆژی حەشر دەکەن، هەروەك چۆن تۆوەکان چاوەڕێی وەرزی بەهاریان دەکرد.. خۆ ئەگەر لاشەش لەناو بچێت و خانەکانی شی ببنەوە، ئەوا ڕۆح بەپەرۆشەوە چاوەڕێی سەرلەنوێ دروست کردنەوەی لاشەکەیە....

ئەو پەروەردگارەی هەموو ساڵێك بوونەوەرێکی سادەی وەك گژوگیا و مێروو سەرلەنوێ دروست دەکاتەوە، ئایا لێدەگەڕێت

جەستەی بوونەوەرێکی ناوازە و ژیری وەك مرۆڤ لە ناو خاکدا شی ببێتەوە و تەواو؟ بێگومان نەخێر.

– باشە ئەو زاتە هەموو بەهارێك ژینێکی تازە دەبەخشێتەوە بە رووەك، ئەی ناتوانێت تەمەنێکی نوێ لە (دنیای نەبڕاوە) بە مرۆڤ ببەخشێت؟ واتە هێندەی دەستەڵات نییە؟

بێگومان، ئێمە بڕوامان هەیە کە لە توانایدا هەیە تەمەنێکی نەبڕاوە بە مرۆڤەکان ببەخشێت، ئایەتەکەی سەرەتاش ئەم ڕاستییەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە.[1]

---

١– لە وتەی (دەیەم)ەوە وەرگیراوە.

## ئایا ئەگەر درەختەکانی بەهەشت بانگ بکرێن، دێن بەدەم بانگەکەوە و، وەڵام دەدەنەوە؟



مادده بێگیان و بێ عەقڵەکانی ئەم دنیایە لەو دنیا گیانلەبەر و فامیدەن، واتە درەختەکان هەروەك مرۆڤەکانی ئەم دنیا، بەردەکان هەروەك ئاژەڵەکانی ئەم دنیا لە فەرمان تێدەگەن و ئەنجامی دەدەن.

واتە ئەگەر تۆ بە دارێك بڵێیت: "فلانە میوەم بدەرێ"، پێت دەدات، ئەگەر بە بەردێك بڵێیت:"وەرە"، دێت.

– کاتێك باسی (بەهەشت) دەکرێت، یەکسەر چی دێت بە خەیاڵماندا؟

– جێگەیەك دێتە بەرچاومان کە هەرچی بە خەیاڵماندا بێت تێیدایە..

لەڕاستیدا شتانێکیشی تێدایە کە بە خەیاڵی هیچ بوونەوەرێکدا نەهاتووە.

هەروەك پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموویێت: "لە بەهەشتدا شتی وا هەیە، کە نە هیچ چاوێك دیویەتی و، نە هیچ گوێیەك هەواڵی بیستووە و، نە بە دڵی هیچ کەسێکدا هاتووە".

ژیانی ناو بەهەشت لە ژیانی ئەم دنیایەمان جیاوازە، چونکە جارێکی دیکە مردن بەرۆکمان ناگرێتەوە و، ژیانێکی تاهەتاییە.

ساڵ و، مانگ و، ڕۆژ و، کاتژمێر و، خولەك و ئەمانە گشتیان لە بەهەشتدا نامۆن، ئەو شتەی کە پێی دەڵێین (کات)، لە بەهەشتدا ئاسەواری نامێنێت، کە (کات)یش نەما نە ڕۆژ و نەشەویش نامێنێت..

بەهەشت هەمیشە ڕووناك و پڕنوورە، کەش و هەوایەکی فێنك و ئارامبەخشی هەیە.

لەبەهەشتدا وەرزیش نییە، نە بەهار و، نە هاوین و، نە پایز و، نە زستان، کەش و هەوا وەك کەشێکی تێکەڵ لە بەهار و هاوین وایە، بەڵام بە کەشێکی بەهەشتییانە...

- لەبەهەشتدا چەندێك دەژین؟ یەك ملیۆن ساڵ؟ یەك ملیار ساڵ؟

- نا.. لە بەهەشتدا ساڵ و شتی وا هەر نییە، ئەی ئێمە نەمانوت (کات) نامێنێت، کەواتە لەوێ ژیانێکی تاهەتایی و، تەمەنێکی بێ کۆتامان دەبێت...

- عەقڵی مرۆڤ ئەمە وەرناگرێت، وانییە؟

- ئاخر لەبەهەشتدا هەموو شتێك بێ سنوورە.

هەندێ شتی ئەم دنیایە بە شێوەیەکی جیاواز لە بەهەشتدا دەبینینەوە و، سەرسام دەبین پێیان، دەممان تەتەڵە دەکات، چونکە بەهەشت هەموو شتێکی سەرنجڕاکێش و ناوازەیە.

تەنانەت گەر دارمۆزێك لە دووری دوورەوە ببینن و، مۆزێکی زۆری گرتبێت، ئێوەش دڵتان ئارەزووی بکات و، حەز بکەن لێی بخۆن، ئەوا هەر پێویست بەوە ناکات بچیت بۆلای دارەکە، هێندە بەسە کە بڵێیت: "ئەی مۆز! وەرە بۆ ئێرە!".

دارمۆزیش، هەر لەو دوورەوە پەلێکی درێژ دەکات بۆ لاتان، تا تۆ چەندت ئارەزوو لێ بێ مۆز لێبکەیتەوە و، بە دڵی خۆت بیانخۆیت.

ئەزانن چی دیکەش دەبینن؟ لەجێی ئەو مۆزانەی کە تۆ لە دارمۆزەکەت کردووەتەوە، دەمەودەست لە جێگەکەیانەوە مۆزی دیکە دروست دەبێتەوە، بە پێگەیشتوویی و بە هەمان تام و ڕەنگ و بۆن!



ئای خودایە! ئەمە چەند سەرنجڕاکێشە!

ئێوە چەندێك مۆز لێبکەنەوە و بیخۆن و، هەر کە بە دارمۆزەکەتان وت: "بڕۆرەوە جێی خۆت"، یەکسەر دەگەڕێتەوە جێی خۆی.

لەبەرئـەوەی لـە بەهەشـتدا کـات و وەرزەکـان نـین، هـەر کـات بتانەوێت هەموو جۆرە میوەیەك ئامادەیە، ناوی هەر میوەیەك بێت بە خەیاڵتاندا، دانە دانە لەبەر دەمتاندا ڕیز دەگرن، وەك ئەوەی هەریەکە لە لایەکەوە بڵێن: "یەکەمجار من بخۆ، یەکەمجار من...".

تەماشا دەکـەن باڵندەیـەکی ڕەنگـین، بـە چریکەچـریك دەفڕێـت، چـاو و دڵتـان ڕۆشـن دەکاتـەوە و، ئاختـان ئـارام دەکاتـەوە و، کەیفخۆشتان دەکات و، زەردەخەنە دەخاتە سەر لێوانتان.

چ دیمەنێکی جوانە!

بەپێی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز، لـە بەهەشـتدا ڕووبـاری شـیر و هەنگوین و مەی و ئاوی سازگار هەیە و، بە ژێر ئەو کۆشـکەدا دەڕۆن کە تیاییدا دەژین.

ئێوەش لەگەڵ ئەم ڕووبارانەدا دەبنـە دۆسـت و هـاوەڵ، بـۆ هـەر جێیەك بڕۆن و، حەز بکەن ڕووباری شیر و هەنگوینیش لەگەڵتان بێت، تەنها پێیان بڵێن: "بە شوێن ئێمەدا وەرن!"، بـۆ هـەر کوێیـەك بـڕۆن ڕووبارەکان شوێنتان دەکەون.

ئای! ئەبێ گەشـت و سـەفا لەگـەڵ ڕووبـاردا چـەند خـۆش بێـت، وانییە؟

## ئەوەی کە لەبەهەشتدا دەیخۆین، چی لێ دێت؟

چەندەتان ئارەزوو لێبوو خواردتان و خواردتانەوە..

لـە دنیـادا کاتێـک شـتێك دەخۆیـت، جەسـتە مـاددە خۆراکییـە بەسوودەکانی لێوە دەمژێت و، دەیکاتە نێو خوێنـەوە، پاشمـاوە بـێ سـوود و زیانبەخشەکەشـی دەردەداتـە دەرەوەی لـەش؛ بـەڵام لەبەهەشتدا جێی فرێدانی پاشماوە نییە.

- بۆچی؟

- چـونکە لەبەهەشـتدا پێویسـتمان بـە دەسـت بـە ئـاو گەیانـدن (چـوونە تـەوالێت) نییـە. پێغەمبەریشـمان ﷺ لـە فەرمایشـتێکیدا لەبارەی ئەمەوە دواوە.

- باشە ئەی چی بەسەر ئەو شتانە دێت کە دەیخۆین؟ دەچن بـۆ کوێ؟ چۆن لە لە شمان دەردەچن؟

- لەبەهەشتدا هەرشتێك بخۆین، پاش ئەوەی لـە گـەدە تێپـەڕی، دەبێت بە ئارەقێکی بۆن خۆش و، لە لەشدا نامێنێت.

- باشە چۆن باشتر لەمە تێبگـەین؟ لـە دنیـادا هـیچ نموونەیـەکی هەیە؟

- بەڵێ، نموونەی ئەمە دار و درەختە.

درەختەکان هەموو خۆراکێکیان لـە خاکـەوە وەردەگـرن، سـەرنج بدەن، گشت ئەو پەینە تەواو دەکەن کە لە بنیان دەکرێـت و، ئـاوێکی

زۆر دەخۆنەوە، هەناسە دەدەن، بەڵام جیاواز لە ئێمە، چونکە ئەوان (دوانە ئۆکسیدی کاربۆن) هەڵدەمژن و، (ئۆکسجین) دەدەنەوە و، وەك مرۆڤ و ئاژەڵەکان هیچ پاشەڕۆیەکیان نییە.

ئەوەتا هەرگیز لە ژێر دارێکدا پاشەڕۆ نابینیت، هەرچەندە دارەکە گەورەش بێت، هەر چەندە میوەیەکی زۆریش بەرهەم بهێنێت.

سەرەڕای ئەو هەموو خواردن و خواردنەوەیەیان، بەڵام دەوروبەرەکەیان پاکوخاوێنە و، هیچ پاشاڕۆیەکی لێ نییە.

گەر دارێکی هێندە سادە بەو جۆرە بێت، ئەی بۆ نابێت لەبەهەشتدا مرۆڤێکی کامڵ و تەواو لاشەی بەو جۆرە بسازێنرێت؟!

## لەبەهەشتدا چی نییە؟

– باشە چی لە بەهەشتدا نییە؟

– لەبەهەشتدا هەموو شتێکی جوان و بێ وێنە هەیە، بەڵام ئایا دەزانی چی تێدا نییە؟

دووبارە هەروەك پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ ڕوونیکردووەتەوە، لە بەهەشتدا مرۆڤەکان تف ڕۆناکەن، بەڵغەمیان نابێت، لە جەستەیانەوە هیچ جۆرە شلەیەکی هاوشێوەی خوێن نایەتە دەرەوە.

– لەبەرچی؟

– چونکە لە بەهەشتدا هیچ شتێك نییە کە مرۆڤ ناڕەحەت بکات و ئازاری بدات، یا بریندار بکات.

لەبەهەشتدا شتێکی دیکەش نییە، دەزانن چییە؟

حەزدەکەن با من پێتان بڵێم: خەو، لە بەهەشتدا خەویش نییە!

- لەبەر چی؟

- چونکە مرۆڤ لەبەهەشتدا هەرگیز هەست بە ماندوویەتی ناکات تا پێویستی بە پشوودان بێت. هەروەها لەبەهەشتدا تاریکایی و شەویش بوونی نییە.

بێگومان مەراقی ئەوەتانە کە بزانن: لەبەهەشتدا مرۆڤەکان لە چ قۆناغێکی تەمەنیاندا دەبن.

ئەو منداڵانەی کە پێش تەمەنی پێگەیشتن و باڵغ بوون دەمرن، لەبەهەشتدا هەر بە منداڵی دەمێننەوە و لای دایك و باوکیان ژیان دەبەنە سەر و، خزمەتی ئەوان دەکەن.

هەر کەسێکیش پاش قۆناغی باڵغ بوون و پێگەیشتن بمرێت و، خوای گەورە ژیانی بەهەشت بکاتە نسیبی، ئەوا بێ جیاوازی ئافرەت و پیاو گشتیان تەمەنیان لە نزیکی (٣٢)ساڵدا دەبێت.

- ئایا تەمەنیان لەوە زیاتر نابێت؟

- نەخێر، هەمیشە لەو تەمەنەدا دەمێننەوە، واتە مرۆڤەکان لەبەهەشتدا بۆ تامەتایە بە گەنجی دەمێننەوە!

ئەها دەبیبیستن کە دەڵێن:"خودا گەنجێتیی بەهەشتمان بە نسیب بکات!". بەکورتی؛ لەبەهەشتدا پیربوون و بەساڵاچوون نییە.

لەبەهەشتدا شتێکی دیکەش نییە، ئەویش (مردن)ە.

لەوێ مرۆڤەکان نامرن، بۆ تاهەتایە زیندوو دەمێننەوە.

– واتە یەك ملیار ساڵ، یەك تریلیۆن ساڵ دەژین؟

– نەخێر، لەبەهەشتدا بەم شێوەیەی دنیا کات و تەمەن و ساڵ نییە.

واتە تاهەتایە دەژین.. [1]

---

١– لە وتەی (بیست و هەشتەم)ەوە وەرگیراوە

## تا چەندێك فریشتەكان دەناسین؟



كە دەوترێت: "فریشتە"، سەرەتا چ وێنە و وشەگەلێك دێن بە خەیاڵماندا؟

بوونەوەری ڕووخۆش، ڕۆحسووك، جوان... هەمیشە حەز بە چاكەی ئێمە دەكەن و، دەیانەوێت مرۆڤێكی باشبین.. نیگا (وەح)ی كاری باش و بەسوودمان بۆ دەكەن.

بەواتایەكی دیكە، فریشتەكان وێنەی ڕەنگدەرەوەی باشییەكانی ناخی ئێمەن.

– كەواتە فریشتەكان هەن، بەڵام چۆن؟

– ئەگەر چەمكی وەك باشی و، جوانی و، نوور و پرشنگ و خۆشەویستی بوونیان هەبێت، ئەوا فریشتەش بوونی هەیە، چونكە فریشتەكان نموونەی هەموو شتێكی جوان و باشن.

بۆ نموونە کاتێك باس لە مرۆڤێکی باش بکرێت دەوترێت: "کەسێکی هێندە چاکە، دەڵێی فریشتەیە".

***

مرۆڤ هەیە؟ بەڵێ هەیە، ئاژەڵ هەیە؟ بەڵێ ئەویش هەیە، دەی کەواتە بۆچی فریشتە بوونی نەبێت! ئەگەر فریشتە نەبێت ئەوا مرۆڤ و ئاژەڵ و ڕووەك و ئەستێرە و گەردوون بەگشتی بوونی نابێت.

لەم دونیایەدا بوونەوەرێکی ژیر گەر هەبێت (مرۆڤ)ە، مرۆڤیش تەنها دەتوانێت ئەو کارانە ڕایی بکات کە بە چاوی خۆی دەیانبینێت.

جگە لەو شتانەی کە ئێمە دەیانبینین، شتی دیکە زۆر زۆرن کە ئێمە نایانبینین و، توانای بینینیانمان نییە، یاخود لە دەرەوەی سنووری توانای بینینی ئێمەن...

خۆ پێویستە لەو جێگایانەش بوونەوەرانێك هەبن کە ژیر و ئیشکەربن، کەواتە بوونەوەرە ژیرەکانی ئەو جێگایانەش فریشتەکانن، کە دروستکراوانێکی ڕۆحانین.

لەم زەمینەی ئێمەدا، لە وشکانی و لە دەریایدا و، لە ناخی و لە دەرەوەی، لە سەر ڕووەکەی و لە هەواکەیدا چەندین بوونەوەر هەن کە گومانمان لە بوونیان نییە.

دەی باشە، گەر هەسارەیەکی بچووکی وەك زەوی لە هەموو شوێنێکیدا بوونەوەر هەبێت، لە ملیارەها هەسارە و ئەستێرەی

دیکەی ئـەم گەردوونـەدا کـە ئێمـە نـاتوانین لـە نزیکـەوە بیـانبینین بوونەوەرێك نییە؟

ژیرییمان دەڵێت: هەیە.

دەی بە بەشێك لەو بوونەوەرانە دەڵێن فریشتە.

***

– فریشتەکان تەنها لە ئاسمان و سەر هەسارەکاندا هەن؟

– نەخێر، لە هەموو جێیەکدا هەن.

ئەرکی هەندێك فریشتە پاراستنی ئێمەیە لـە مەترسـی، بەمانـەش دەوترێت (فریشتەی پارێزەر).

(فریشتە بەڕێزە تۆمارکارەکان) چاکە و تاوانەکانی ئێمە لە نامەی کردەوەکانماندا دەنووسن.

کاتێـك ئەجـەلی مردنمـان دێـت، فریشـتەیەك بـە نـاوی (ئیزرائیـل) بەرپرسە لە ڕۆح کێشانمان.

ئەو فریشتەیەی کە لە لایەن خوداوە پەیامی بۆ پێغەمبەرمان ﷺ دەهێنا، ناوی (جوبرەئیل)ە.

ئەو فریشتەیەی کـە کاروبارەکـانی سـەر زەوی ڕێکـدەخات نـاوی (میکائیل)ە.

***

– ئەی بۆ ئێمە ئەو فریشتانە نابینین؟ تۆ بڵێی لە کـوێ بـن؟ کـە هێندە لێمانەوە نزیکن بۆچی نایانبینین؟

– ناتوانین بیانبین، لەبەر ئەوەی پێویستە نەیانبینین.

– بۆچی؟

– لەبەر ئەوەی چاومان توانای بینینی هەموو شتێکی پێ نەبەخشراوە، چونکە پێکهاتەکەی بەو شێوەیە دروستکراوە.

چەندین بەهای گەورە هەیە کە گومانمان لە بوونیان نییە، کەچی نایانبینین، بەڵام هەروەك ئەوەی کە بە چاوانی خۆمان بیانبینین بڕوامان پێیانە. لەو بەهایانەش: عەقڵ، ڕۆح، چەندین هەست و هەزاران شتی دیکەش...

ئەو هۆیەی کە بەربەستە لە بینینمان بۆ ئەم شتانە، هەر هەمان ئەو هۆیەیە کە وا دەکات فریشتەکان نەبینین.

خۆ تەنها (سەر) چاوی نییە!

عەقڵ چاوی پەسەندکردنی شتەکانی هەیە، دڵ چاوی باوەڕهێنان و عاشقبوون و شەیدایی هەیە، مێشك چاوی بیرکردنەوە و لێ ڕامانی هەیە... لە مرۆڤدا چەندین چاوی دیکەش هەیە!

بڕوامان بە بوونی فریشتەکان هەیە، مرۆڤ بە چاوی دڵ بڕوا بە شتێك دەکات کە نەیبینێت، شتی دیار و لەبەرچاوانیش پێویست بەوە ناکات هەوڵ بدەین بڕوا بە بوونی بکەین، چونکە چەمکی بڕواکردن بابەتێکە پەیوەست نییە بە بینینەوە.

بەڕاست، چاومان توانای بینینی میکرۆبەکانی هەیە؟ گوێمان دەنگی زۆر نزم دەبیستێت؟! نەخێر، نایبینێت و ناشیبیستێت، شتە

دوورەکـانیش بـە هـەمان شـێوە نـەدەیانبینن و، نـە دەنگیشـیان دەبیستین.

– بۆچی؟

– چونکە خوای گەورە گوێ و چاومانی بەو شێوەیە دروست کردووە.. ئایا دەتوانین بڵێین لەبەر ئەوەی ئێمە نایانبینین و دەنگیان نابیستین، ئیتر کەواتە بوونیان نییە؟!

– بەدڵنیاییەوە نەخێر.

کەواتە فریشتەکانیش هەن، بابەتی بوونی ئەوان پەیوەست نییـە بـە توانـای بیـنین یـان نـەبینی ئێمـەوە بۆیـان، بـەڵکو پەیوەنـدی بـە بڕوابوونمانەوەیە بە بوونیان.

– ئایا فریشـتەکان تـەنها لـە ئاسمـان و سـەر ئەسـتێرەکان و لـە دەوروبەری مرۆڤەکاندا هەن؟ واتە لە جێگای دیکەدا نین؟

– نەخێر، ئەوان لەشوێنی وادا هەن، کە مرۆڤ سەری دەسـوڕمێت لێیان.

هەر گوڵێك، هەر گەڵایەك، هـەر مێروویـەك، لـە بچـووکترینەوە تـا زەبەلاحترین بوونەوەر فریشتەیەکی لەگەڵدایـە، ئـەو فریشـتانەش کـە لەگەڵ هەور و باو هەورە بروسکە و دەریا و چیاکاندان ئـەرکی خۆیـان لەوێ بەجێدەهێنن.

بـەجۆرێك، كـە هـەر دڵۆپـە بارانێـك و، هـەر تنۆكـە بـەفرێك فریشتەیەك دەیهێنێتە سەر زەوی.



ئەو دڵۆپە بارانانـە، یـاخود ئەو كلۆی بەفرانە كە لە هەزاران مەتر بەرزییـەوە و هەنـدێ جار لەگـەڵ ڕەشـەبای بەهێزیشـدا دەبارێنـە سـەر زەوی، كەچـی بەریـەك ناكـەون و وەك یـەك تۆپەڵ نایەنە خوارەوە..

باشـە ئەمـە ڕێكەوتـە؟ ڕووداوێكی هەڕەمەكییە؟ یاخود خـوای گـەورە فـەرمان بـە فریشـتەكان دەدات بـەو شـێوە جوان و بێ وێنەیە بیبارێنن؟

بێگومان مرۆڤی ژیر بڕوای بەوەیە كە خوای گەورە فـەرمانی داوە بە فریشتەكان ئەم كارە بەم جوانیی و وردەكارییەوە ڕاپەڕێنن...

پەروەردگار كارگەی گەردوونی بە فریشتەكان وەگەڕخستووە.

بڕوابوون بە بوونی فریشـتەكان دڵخۆشـی و ئارامییـەك بـە ئێمـەی مرۆڤ دەبەخشێت.. ئەوەتا ئەوان گشت چاكەكانمان دەنووسـن، واتـە گشـت كـارێكی چـاكمان لای ئـەوان پـارێزراوە و، ون نابێـت، چـونكە

ئـەوان وەك وێنـەگرێك بـەردەوام وێنـە دەگـرن.. هـەر بۆیـە ئـەو پەرستشانەی کە ئەنجامیان دەدەین و، ئەو خزمەتانەی کە دەیکەین، بەهەدەر ناڕۆن.

ئەوانن کە نیگای کاری چاکە و باش بۆ ئێمە دەکەن و بیرمان دەهێننەوە، هەروەها ڕێی کاری چاکەمان پیشان دەدەن و، بەردەوام بیر لە چاکەی ئێمە دەکەنەوە.

چاودێریی ئێمە دەکەن و دەمانپارێزن لـە مەترسی و لەناوچوون و، هەوڵ دەدەن بەدوورمان بکەن لە ناڕەحەتییەکان.

ئەها کاتێـك منـداڵێك لـە جێیـەکی کـەمێك بـەرزەوە دەکەوێتـەوە خوار و، هیچـی لێنایـەت و، سـاغ و سـەلامەت دەمێنێت، لـەو کاتـەدا دەڵێن: "بەخوا منداڵ فریشتەی لەگەڵە و، دەیپارێزێت".

خودا فریشتەکانی لە نوور دروستکردووە، (نوور) ئـەو ڕووناکی و پرشـنگ و جوانییەیـە کـە ئێمـە نـاتوانین بەچـاوی ئاسـایی خۆمـان بیبینین.

فریشتەکان وەك مرۆڤەکان ڕەگەزی نێر و مێیان نییە و، ئـارەزوو و نەفسیان نییە، خۆراك ناخۆن و شلەمەنی ناخۆنەوە، هاوسەرگیری و زیادبوونیان نییە، توڕەبوون و هەڵچوونیان نییە...

فریشتەکان وەك هەوان و، دەتوانن بچنە هەموو جێیەك، هەروەها وەك تیشکی ڕۆشنایین، هیچ شتێك نابێتە بەربەست لەبەردەمیاندا.

فریشتەکان بەردەوام تەسبیحات و یادی خودا دەکەن، لە هەمان کاتیشدا ئەم زیکر و تەسبیحاتەیان وەك جۆرە خۆراکێکە بۆیان..[1]

---

١- لە وتەی (بیست و نۆیەم)وە وەرگیراوە.

# پێغەمبەرمان ﷺ چی هێنا؟



**ئەگەر ئەو نوورە نەبووایە، ئەوا هەموو گەردوون و، هەموو بوونەوەران، تەنانەت مرۆڤەکانیش بێ بەها دەبوون.**

**ئەم پرسـتانەی سـەرەوەش پێغەمبـەری ئازیزمـان ﷺ پـێ دەناسێنن..**

**– واتە پەروەردگار هەموو گەردوون و بوونەوەران و مرۆڤایەتی تەنها لەبەر ڕێزی ڕووی ئەو نازدارە بەدی هێناوە؟! ئەمە چۆن دەبێت؟**

**گەردوون قوتابخانەیەکە، مرۆڤەکانیش خوێندکاری ئەم قوتابخانەیەن، قورئانی پیرۆزیش پەرتووکی ئەم قوتابخانەیە.**

ئێستا قوتابخانەمان هەیە و، پەرتووکێکمان هەیە، بەڵام مامۆستا نییە.. قوتابخانە بێ مامۆستا دەبێت؟! یا هەرگیز وانەی تێدا دەوترێتەوە؟!

خوێندکارانی ئەم خوێندنگەیە چی بکەن؟ چۆن پەروەردە ببن؟ ئاوا ئاکامیان بەکوێ دەگات؟

لەم بارەدا خوێندکارەکان بە بێ سەرەوبەرەیی و بێ ئامانج پەروەردە دەبن و، هەر بە نەزانی دەمێننەوە.

– حکومەت بۆچی خوێندنگە دەکاتەوە؟

– دیارە بۆ پەروەردەکردنی نەوەکانی وڵاتە.

– ئەی کێ ئەرکی پەروەردەکردنی لەسەر شانە؟

– مامۆستا.

– کەوایە خودای مەزن بۆچی گەردوونی خولقاندووە؟

– لەبەر مرۆڤەکان؟

– ئەی ئەرکی سەرشانی مرۆڤەکان چیە؟ بۆچی نێردراوەتە سەر ئەم زەوییە؟ کێ وەڵامی ئەم پرسیارانە دەداتەوە؟

– پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت).

مامۆستای قوتابخانەی گەردوونیش پێغەمبەرمانە ﷺ.

پێغەمبەر ئەو کەسەیە کە گشت ئەو زانستەی لە لایەن خوداوە بۆی ڕەوانە کراوە، بە مرۆڤەکانی دەگەیەنێت و پەروەردەیان دەکات،

فێریـان دەکـات بـۆ ئـەوەی ببنــە بەندەیـەکی چـاکەکار، هــەر بـەو شێوەیەی کە پەروەردگاریان پێی خۆشە.

پێغەمبەرمانﷺ ئەو ئەرکەی پێی سپێردرابوو، بە تەواوی بەجێی گەیاند.

– چۆن؟

– بەشـێکی زۆری خـەڵکی ئـەو سـەردەمە، کەسـانێکی نـەزان و، دەشتەکی و، قین لە دڵ و، دەمارگیر و، بێ ویژدان و، بێ باوەڕ بوون، بێگومـان هـەموو جـۆرە خراپەیـەکیش لـە کەسـی لـەم شـێوەیەوە دەوەشێتەوە.

هێندە بەکوێرانـە خۆیـان وابەسـتەی بیروبـاوەڕی هەڵـەی خۆیـان کردبوو، کە هیچ هێزێك نەیدەتوانی پاشگەزیان بکاتەوە.

پێغەمبــەرمان ﷺ یــادی خــودای تــاك و تــەنها و ڕاســتەقینەی هێنایەوە بیری ئـەو خەڵکـە و، بـانگی کـردن بـەرەو بـاوەڕ، هـەروەها مژدەی ژیانی نەبڕاوەی دوا ڕۆژی پێدان، لە پەرستنی خودا بێگیـان و لــە بــەرد و دار دروســتکراوەکانیان پەشــیمانی کردنــەوە، پاشــان بانگەوازی کردن بۆ پەرستنی خودای تاقانە.

ئەو کەسانەی تاکە تاکە لە قوتابخانەکەی پێغەمبەرمانداﷺ فێـر دەبوون، بەرەو ئاسوودەیی و دڵخۆشی و مرۆڤایەتی و ڕەوشـتی بـەرز گەڕانەوە.

کاتێکی زۆری نەبرد، ئەم کەسانەی پەروەردەی دەستی پێغەمبەرمان ﷺ بوون، بوونە مرۆڤانێکی زۆر پێگەیشتوو و ژیر.



پێش هاتنی پێغەمبەرﷺ، هەندێك پیاو کچیان بە ڕۆڵەی خۆیان نەدەزانی و، نەیان دەویست وەك باوکی کچ بناسرێن، بۆیە کچەکانیان بە زیندوویی لە چاڵدەنا.. بەڵام دواتر هێندە بە سۆز و دڵنەرمییەوە پەروەردەی دەستی پێغەمبەرمان ﷺ بوون، کە تەنانەت نەیان دەتوانی مێروولەیەکیش بکوژن.

پێغەمبەرمان ﷺ مژدە و هەواڵی زۆر خۆشی بەوان دەدا، بەمەش بە تەواوی ژیانیان گۆڕا، بەگشتی ئەم مژدانەی پێ دەدان:

"ئێوە بۆ زیندوونەبوونەوە و ڕزین نامرن، بەڵکو دووبارە زیندوو دەکرێنەوە، ژیانێکی نەبڕاوە چاوەڕێتان دەکات، بە پشتیوانی خودا دەچنە بەهەشتەوە، باوەڕهێنانتان و پەرستش کردنتان بێ هودە بەفیڕۆ ناچێت، خۆشبەختییەکی بێ کۆتا باوەشی بۆ کردوونەتەوە، ئێوە هەروا بێ ئاکام دروست نەکراون، هەریەکەو ئەرکێکتان هەیە".

ئیتر ئەم کەسانەی ئاوا موسوڵمان بوون و لە پێغەمبەرەوە ﷺ فێر بوون، نازناوی هاوەڵی پێغەمبەر (صەحابی)یان لێنرا، واتە هاوەڵانی بەدەنگەوەچوونی بانگەوازەکەی پێغەمبەرمان ﷺ بوون.

بەڕاستی پێغەمبەرمان ﷺ گۆڕانکاری زۆر گەورەی لە جیهاندا هێنایە کایەوە!

ئەوەتا لەم سەردەمەی ئێستەماندا هیچ دەوڵەتێکی زەبەلاح، یا حکومەتێکی بەدەستەڵات ناتوانێت تەنانەت خوویەکی سادەی وەك جگەرەکێشان بنەبڕبکات.

بەڵام پێغەمبەرمان ﷺ چی کرد؟

بە دەستەڵات و هێزێکی زۆر کەم و، لە ماوەیەکی کورتدا، زۆر خوو و ڕەفتاری لە ناخی ئەم مرۆڤە دەمارگیرانە داماڵی.

خەڵکی ئەو سەردەمە تووشی کێشە و گرفتی ڕەفتاریی و کۆمەڵایەتی بووبوون، وەك: مەی خواردنەوە و، بەرتیل دان و، قومار

کـردن و، سـووخۆریی.. هـەروەها ئاژەڵـەکانیان دەچەوسـاندەوە و، ئافرەتەکانیان بە مرۆڤ نەدەزانی، مرۆڤەکانیشـیان دەکـردە کۆیلـە و، بە ئارەزووی خۆیان ئەشکەنجەیان دەدان و، کڕین و فرۆشتنیان پێوە دەکردن.

لـە خورمـا پەیکـەریان دروسـتدەکرد و دەچـوونە بەرامبـەری و کڕنووشـیان بـۆ دەبـرد، کەچـی کاتێـك برسـێتی زۆری بـۆ دەهێنـان، دەیانخوارد!

دەبینین پێغەمبەر ﷺ چاکسـازی لـەناو گـەلێکی لـەم شـێوەیەدا کـردووە و، ڕاسـتەڕێی بـاوەڕی پیشـان داون و، لـە کـارە خراپـەکان دووری خستوونەتەوە.

لە کۆمەڵگەیەکی هێندە هەڵەکار و لادەردا، کەسانێکی باوەڕدار و ڕەوشتبەرز و بەسۆز و قارەمانی پێگەیاند.. ئەوەتا تـەنها لـە حـەجی ماڵئاواییدا نزیکەی سەد و بیست هەزار موسـوڵمان لە دەوری پێغەمبەر ﷺ ئامادە بوون.

پاش ماوەیەکیش یەك لەسەر پێنجی مرۆڤایـەتی بوونـە هـەڵگری پەیامی ئاشتی ئەو و، ئیسلامیان هەڵبژارد.

ئێستاش یـەك ملیـار و نیـو کـەس شوێن پێـی ئـەویان گرتـووە.. کەواتە ئەگەر پێغەمبەرمان ﷺ نەبوایە، دنیا دەکەوتە بارودۆخێکەوە کە ژیانی تێدا نەدەبوو و، هەموو شتێك مانای خۆی لەدەسـت دەدا و، دنیا دەبووە دۆزەخ.

به بوونه پێغەمبەری ئەو، دنیا بووە بەهەشت و، ڕووی مرۆڤـەکان گەشایەوە.. ئای! چ شانازییەکە بۆ ئێمـە کـە پێشڕەو و سـەرکردە و پێغەمبەرێکی وامان هەیە!

ئـەو ئێمـەی زۆر خۆشـدەوێت و، زۆر تامـەزرۆی بینینمانـە، گـەر ئێمەش ئەومان خۆشبوێت، پشتیوان بە خوا لەبەهەشتدا لەگەڵ ئـەودا دەبین.[1]

---

١- لە وتەی (نۆزدەیەم)ەوە وەرگیراوە.



# قورئان چۆن باس له تەكنەلۆجیای ئەمرۆمان دەكات؟

له قورئاندا موعجیزەی هەر پێغەمبەرێك باسكراوە.

– ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێت) له ئاگردا نەسووتا.

– سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت) سوار شنەبا دەبوو و دەفڕی.

– داوود (سەلامی خوای لێبێت) لە ئاسن هەموو شتێكی سازدەكرد.

– عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) بە مۆڵەتی خودا مردووی زیندوودەكردەوە و، بینایی چاوانی بۆ نابینا دەگێڕایەوە.

موعجیزە: ئەو كارە نائاساییەیە كە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) كردوویانە و، بووەتە سیفەتی جیاكەرەوەیان، بەڵگەش بووە لەسەر ئەوەی كە پەیامبەری خودا بوون لەسەر زەوی.

پێغەمبەران هەم لە كاروباری ئایینیدا هەم لە كاروباری دنیاشدا پێشەوا و پێشەنگی مرۆڤەكانن.

موعجیزەی سەرەتای پێشكەوتنی زانست و تەكنەلۆجیان.

# ئەو پێغەمبەرەی کە فڕی !

باوکی تەکنەلۆجیای ئاسمانیی پێغەمبەر سولەیمانە (سەلامی خوای لێ بێت)، موعجیزەکەیمان لەو ئایەتە پیرۆزەوە بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە خوای گەورە دەفەرموویێت:

﴿وَلِسُلَيْمَـنَ الرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَ رَوَاحُهَا شَهْرٌ﴾ سبأ: ١٢، واتە: (بایشمان ڕام کردبوو بۆ سولەیمان تاقی بەیانیان مانگەڕێیەك و تاقی ئێواران مانگەڕێیەکی ئەبڕی).

خودای مەزن بای خستە ژێر فەرمانی سولەیمان پێغەمبەرەوە (سەلامی خوای لێبێت)، حەزرەتی سولەیمانیش بە (با) ڕۆژە ڕێیەکی بەیەك کاتژمێر دەبڕی.

کەواتە، مرۆڤ توانای فڕینی هەبووە ! ئەوەتا سولەیمان پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) بێ هیچ ئامێرێك و تەنها بە با بۆ هەر کوێیەك ویستی لێبوایە دەڕۆیشت.

لەژێر ڕۆشنایی ئەم موعجیزەیەدا ئەم پەیامەی خوای گەورە تێ دەگەین:

"ئەی مرۆڤ، واز لە تەمبەڵی بهێنە، تێبکۆشە و ئامێرێك بۆ فڕین دروستبکە، تا بەهۆیەوە ڕێیەکی دوور بە ماوەیەکی کەم ببڕیت".

دوای سەدان ساڵ، مرۆڤایەتی بەدەم ئەم بانگەوازەوە چوو و ئامێرێکی بۆ فڕین دروستکرد.

هـــــەموو فڕۆكـــــە و، هەلیكۆپتـــــەر و، موشـــــەك و، ئـــــامێرە پێشـكەوتووەكانی ئاسمـان لـە ژێـر ڕۆشـنایی ئـەم موعجیزەیـەوە هاتوونەتە كایەوە.

تۆ بڵێی لەمەودوا مرۆڤایەتی چی بكات و چی بدۆزرێتەوە؟

## پێغەمبەری بیرهەڵكەن!

خودای پـەروەدگار گۆچانێكی مـوعجیزەی بـە پێغەمبـەر مووسـا (سـەلامی خـوای لێبێـت) دابـوو.. ئـەم گۆچـانە تـەنها پارچـە دارێكـی ئاسایی بوو، بەڵام كاتێك مووسا (سەلامی خوای لێبێت) بەدەستییەوە دەیگرت، كاری زۆر دەرئاسا و نائاسایی پێ دەكرد.

جارێـك مووسـا (سـەلامی خـوای لێبێـت) لەگـەڵ بڕوادارانـدا لـە بیابانێكدا بێ ئاو كەوتن، بۆیـە خەڵكەكـە داوای ئاویـان لـە حـەزرەتی مووسـا كـرد، حـەزرەتی مووسـاش گۆچـانەكەی دەسـتی كێشـا بـە تاشەبەردێكی گەورەدا، لەناكاو لە دوانزە لای بەردەكەوە دوانزە كانی ئاو تەقین و ئاویان لێـوە هـەڵقوڵی، بـەم شـێوەیە هەریـەك لـە دوانـزە هۆزەكـەی كـە لەگـەڵ حـەزرەتی مووسـا بـوون تـا توانییـان ئاویـان خواردەوە.

لەژێر ڕۆشنایی ئەم موعجیزەیەدا ئەم پەیامەی خـوای گـەورە تـێ دەگەین:

"مرۆڤە ژیرەکان! من گۆچانێکم بە بەندەیەکم بەخشی کە بڕوای پێم بوو، ئەویش لە هەر کوێ بیویستایە ئاوی پێ هەڵدەقولاند، گەر تۆش پەیڕەویی یاسا و ڕێساکانی من بکەیت، ئەوا خۆت ئامێرێکی هاوشێوەی ئەو گۆچانە دروست دەکەیت، کەواتە هیممەت بەرە بەر خۆت و دروستی بکە".

لە دوای سەدان ساڵ بەسەر ئەم موعجیزەیەی مووسادا (سەلامی خوای لێبێت)، مرۆڤایەتی بە سوود وەرگرتن لەم موعجیزەیەوە، لە ناخی زەوییەوە بیری ئێرتیوازی ئاوی هەڵکەند و، ئاوی لێ هەڵقولاند، لەم سەردەمەشدا لە چینەکانی ژێر زەویەوە نەوت و گازی سروشتی دەردەهێنرێت.

کەواتە، باوکی تەکنەلۆجیای زەویناسی (جیۆلۆجیا)ی ئەمڕۆ پێغەمبەرێکە، کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بەم شێوەیە ناوی هێناوە:

﴿وإِذِ اسْتَسْقَى مُوسَى لِقَوْمِهِ فَقُلْنَا اضْرِبْ بِعَصَاكَ الحَجَرَ فَانْفَجَرَتْ مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنَا﴾ البقرة: ٦٠، واتە: (یادی ئەو نیعمەتەیش بکەنەوە کە مووسا داوای ئاوی لێ کردین بۆ قەومەکەی، ئێمەیش پێمان وت: بە عاساکەت (گۆچانەکەت) لەو بەردە بدە. کە لێی دا بە ئەمری ئێمە دوانزە کانیی لێ هەڵقوڵی).

## پێغەمبەری مردوو زیندووکەرەوە!

زانستی پزیشکی ئەمڕۆ لە ئاستێکی زۆر پێشکەوتوودایە و، خەڵکی بە دژەڤایرۆس دەکوترێن بۆ خۆپارێزی لە نەخۆشی سیل و گرانەتا و زۆر نەخۆشی دیکەش، کە لە سەردەمانی پێشوودا بێ چارەسەر بوون و دەبوونە هۆی گیان لەدەستدان و مردن، ڕۆژانە نەشتەرگەریی مێشك و دڵ و، نەشتەرگەریی گواستنەوەی گورچیلە و دڵ و جگەر بۆ نەخۆش ئەنجام دەدرێت، لە ئەنجامیشدا ئەو نەخۆشانەی کە لە ژیان بێ ئومێد بووبوون، بەهۆی ئەم پێشکەوتووییەی بواری پزیشکییەوە نەخۆشییە کوشندەکانیان بۆ چارە دەکرێت.

حەزرەتی عیساش (سەلامی خوای لێبێت) پێشەنگی ئەم زانستە بووە، چونکە خوای گەورە موعجیزەیەکی گەورەی پێ بەخشی بوو. واتە ئەو بەمۆڵەتی پەروەردگاری بینایی بۆ چاوی نابینا دەگێڕایەوە و، چارەسەری ئەو کەسانەی دەکرد کە تووشی نەخۆشی (گەڕیی) بووبوون. تەنانەت سێ کەسی تازە مردووی بە فەرمانی خودا بە ژیان شادکردەوە.

حەرزەتی عیسا (سەلامی خوای لێبێت) بێ هیچ ئامێرێك ئەم کارەی دەکرد، بەڕاستی ئەم موعجیزەیە زۆر سەرسوڕهێنەر بوو!

خودای مەزن لەژێر ڕۆشنایی ئەم موعجیزەیەدا سەرنجی ئێمەی مرۆڤ بۆ لای ئەم پەیامەی ڕادەکێشێت:

"مرۆڤەکان، هەموو دەردێك دەرمانێکی هەیە، بێ ئومێدی داتان نەگرێت، بگەڕێن بەدوای چارەسەردا تا دەیدۆزنەوە، بەجۆرێك کە دەگونجێت چارەیەك بۆ مردنیش پەیدا بکەن.. هەروەك چۆن دڵە مردووەکان بە نووری ئیمان زیندوو دەبنەوە، بەو جۆرەش دەکرێت ئەو نەخۆشانەی لە لێواری مەرگدان بە شنەبای ئەو باوەڕە شیفایان بۆ بێت، تۆش لەسەر دەرمانخانەی زەوی من دەتوانیت دەرمانی هەموو دەردێك بدۆزیتەوە، دەسا هەوڵ بدە و چارەسەر بدۆزەوە، خۆ ئەگەر بگەڕێیت، ئەوا بێگومان دەیدۆزیتەوە".

## ئەو پێغەمبەرەی بەدەستەکانی ئاسنی وەك هەویر نەرم دەکردەوە!

گەر لەم ڕۆژگارەدا ناوی پیشەسازی و کارگە ببیستین، یەکسەر ناوی کانزای وەك ئاسن و مس دێت بە خەیاڵماندا، چونکە خەریکە بوارێك نامێنێت ئاسنی تێدا بەکارنەهاتبێت.

کانزای ئاسن بە پوختەنەکراوی لە زەوی دەردەهێنرێت، پاشان دەبرێت بۆ کارگەی ئاسن و پۆڵا، لەوێ پوختە دەکرێت و، لە فڕنێکی گەورەدا لە ژێر پلەی گەرمی (١٥٠٠) پلەی سەدیدا دەتوێنرێتەوە، دواتر دەکرێتە قاڵبەوە و لە جێگەی پێویستدا بەکاردێت.

ئەگەر بتەوێت یەك تۆز شێوەی پارچە ئاسنێك بگۆڕیت، ئەوا پێویستە سەرلەنوێ ئاسنەکە لە کورەدا یا بەهۆی پلەیەکی گەرمی بەرزەوە بتوێنیتەوە یا سوور بکەیتەوە، پاشان بە پیك و چەکوش بەو شێوەیەی دەتەوێت لە قالبێکدا دەیسازێنیت، یا لە قالبی دەدەیت.

پێغەمبەر داوود (سەلامی خوای لێ بێت) ئەم هەموو ئەرکەی نەدەکێشا، چونکە هەر کە ئاسنەکەی دەگرت بەدەستییەوە، یەکسەر ئەو ئاسنە ڕەقە لەدەستیدا نەرم دەبوو و، وەك هەویری لێدەهات، ئیتر هەر شێوەیەکی بویستایە لێی دروست دەکرد.

حەزرەتی داوود (سەلامی خوای لێ بێت) لە ئاسن قەڵغان و زرێی دروست دەکرد، (زرێ)ش ئەو بەرگە ئاسنینەیە کە لە کۆندا سەربازەکان لە کاتی جەنگدا لەبەریان دەکرد، بۆ ئەوەی خۆیان لە شمشێر و ڕم بپارێزن.

پەروەردگارمان ئەمەی کردووەتە موعجیزەی داوود (سەلامی خوای لێ بێت).. خۆ کانزای ئاسن لە پێش داوودیشدا هەبووە و بەکار هاتووە، بەڵام سازکردنی شت و مەك لێی و کارپێکردنی بێ لەئاگرنان و کورەی ئاگرین مەحاڵ بووە، بەڵام خوای گەورە ئەم نەرمبوونەوەیەی ئاسنی کردووەتە موعجیزەی حەزرەتی داوود (سەلامی خوای لێ بێت).

لێرەوە تێدەگەین کە باوکی پیشەسازی ئەمڕۆمان پێغەمبەر داوودە (سەلامی خوای لێ بێت).

ئەو پەیامە خواییەی کە لەم موعجیزەیەوە پێمان دەگات ئەوەیە کە: "بەهرەیەکی وام بە یەکێك لە بەندە گوێڕایەڵەکانم بەخشیوە، کە چی بوێت لە ئاسن بینەخشێنێت، گەر ئێوەش بەپێی یاساکانی گەردوون مامەڵە بکەن، ئەوا ئەو بەهرەیە بەئێوەش دەدرێت".

## پێغەمبەر سولەیمان (سەلامی خوای لێبێت)
## تەنها وێنە ناگوازێتەوە،
## بەڵکو کەلوپەلیش دەگوازێتەوە

لە یەمەن شاژنێك هەبوو، ناوی (بەلقیس) بوو، لەسەر دەستی ئەو شاژنە یەمەنییەکان خۆریان کردبووە خوای خۆیان و دەیانپەرست.

هەر بۆیە حەزرەتی سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت) نامەیەکی بۆ (بەلقیس) نارد و، داوای لێکرد باوەڕ بە خوای تاك و تەنها بهێنێت.

هەر کە (بەلقیس) نامەکەی پێگەیشت، خێرا داروودەستەکەی کۆکردەوە و ڕاوێژی پێکردن و بیروڕای وەرگرتن.

وەزیرە دەمڕاستەکانیشی بڕیاری شەڕیان لاپەسەند بوو، بەڵام (بەلقیس) بە نێردراوەکانیدا دیارییی زۆر گرانبەهای بۆ حەزرەتی سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت) نارد و، ویستی مەسەلەکە بە ئاشتییانە بڕوات بەڕێوە و، شەڕ و کوشتار ڕوو نەدات.

هەر کە پەیامبەرەکانی شاژن کەوتنە ڕێ، حەزرەتی سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت) هەواڵی هاتنیانی پێگەیشت، بۆیە لەناوچەیەکی بەرفراواندا لەشکرێکی لە مرۆڤ و جنۆکە و باڵندەکان ئامادەکرد، واتە دەستەڵات و هێزی خۆی نمایشکرد، ئاخر سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت) تەنها فەرمانڕەوای مرۆڤەکان نەبوو، بەڵکو قسەی لەسەروو هەموو پەری و باڵندە و بوونەوەرانەوە بوو.

پەیامبەرەکانی (بەلقیس) بە فیز و لوتبەرزییەکی زۆرەوە دەڕۆیشتن بەرێدا و، کە گەیشتن دیارییەکانیان لەبەردەم سولەیماندا ڕیز کرد (سەلامی خوای لێ بێت).

هەرچەندە (بەلقیس) ئەم دیارییانەی وەك نموونەی دەوڵەمەندیی و دەستەڵاتی خۆی بۆ حەزرەتی سولەیمانی ناردبوو، بەڵام ئەو دیارییانە لە بەرامبەر باڵادەستیی و شکۆی حەزرەتی سولەیماندا (سەلامی خوای لێ بێت) بێ شەوق و بێ بەهابوون.

حەزرەتی سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت) هەموو دیارییەکانی بە پەیامبەرەکاندا گەڕاندەوە.. کاتێك ئەم پەیامبەرانەش گەیشتنەوە کۆشکی شاژن، چییان دیبوو بێ کەموکورتی بۆ (بەلقیس)یان گێڕایەوە.

کاتێك (بەلقیس) لەبەرامبەر هێز و دەستەڵاتی بێ وێنەی حەزرەتی سولەیماندا (سەلامی خوای لێ بێت) هەستی بە لاوازی خۆی کرد، بڕیاری موسوڵمانبوونی دا، پاشان لەگەڵ کۆمەڵێك خەڵکی

ولآتەکەیدا خۆیان ئامادەکرد تابچن بۆ لای حەزرەتی سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت)، بەڵام پێش ئەوەی بکەونەڕێ کورسی و تەخت و تاراجی گرانبەهای پاشایەتی لە شوێنێکی نهێنیدا شاردەوە و، خۆی لە پاراستنی تەختەکەی دڵنیاکردەوە.

کاتێك حەزرەتی سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت) هەواڵی هاتنی (بەلقیس)ی شاژن و گەلەکەی پێگەیشت، ویستی بۆ ئەوەی بێ دوودڵی بڕوا بە پەیامی خوایی بهێنن ڕووداوێکی سەرسوڕهێنەریان نیشان بدات.. هەر بۆیە ویستی پێش گەیشتنی کاروانەکەی بەلقیس، تەخت و تاراجی شاهانەی (بەلقیس) بهێنێت بۆ لای خۆی، بۆ ئەم مەبەستەش جنۆکە و کەسانی داروودەستەکەی کۆکردەوە و، پێی وتن: کێ ئەم تەخت و تاراجەی (بەلقیس)م بۆ دەهێنێتە ئێرە؟

لەناو پەرییەکاندا تاقمێکی زۆر بەجەرگ و ئازا هەبوون، پێیان دەوترا (عیفریت)، ئەوەبوو یەکێك لەم عیفریتانە هەستا و بە سولەیمانی وت: "پێش ئەوەی تۆ لەسەر جێگەکەت هەستیت، من ئەو تەختەت بۆ دەهێنمە ئێرە".

لەم ناوەدا وەزیرێك هەستایەوە و، وتی: "بەر لەوەی چاوت بتروکێنیت من تەختەکەت بۆ دەهێنم"، ئەمەی وت و، تەختی (بەلقیس)ی هێنایە بەردەستی حەزرەتی سولەیمان!

ئامادەبووان بەم ڕووداوە کەوتنە مقۆمقۆ، لەسەر ئەوەی چۆن لە یەک چرکەساتدا تەختێکی لە دووری چەندین هەزار کیلۆمەترەوە گواستەوە.

ئاخر وەزیر زانستێکی تا بڵێی زۆر فێر بوویوو لەسەر دەستی حەزرەتی سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت)، هەر بۆیە ئەمەش وەک یەکێکی دیکە لە موعجیزەکانی هەژمار دەکرێت.

خوای گەورە نیعمەتی لەم جۆرە بە پێغەمبەرەکانی دەبەخشێت، کە شتی وەک ئەو تەختە مەزن و گرانبەها و دوورەدەستە لە یەک چرکەساتدا بگوازنەوە!

لە سەردەمی ئێمەدا تەنها دەتوانرێت وێنە و دەنگ لە ڕێگەی ڕادیۆ و تەلەفیزیۆنەوە بگوازرێتەوە، ئەمەش ڕوویەکی موعجیزەکەیە، بەڵام هێشتا مرۆڤایەتی بە زانست نەگەیشتووەتە ئاستی گواستنەوەی شت و کەلوپەل بە تەواوەتی و لەیەک چرکەدا.

وەک دەبینین لەم سەردەمەدا دەنگ و ڕەنگ لە ڕێگەی چەندین ئامێری ئەلیکترۆنیی و مانگی دەستکردەوە دەگوازرێتەوە، بەڵام حەزرەتی سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت) لە سەردەمی خۆیدا بێ بەکارهێنانی هیچ ئامێر و ئامرازێك ئەم کارەی دەکرد.

ئەو پەیامە خواییەی دەکرێت لەڕێی ئەم موعجیزەیەوە لێی تێ بگەین بریتیە لەوەی کە:

"مرۆڤەكان! لەم نیعمەتە گەورەیە سوود وەربگرن، هەوڵبدەن و تێبكۆشن بۆ فەرامۆشكردنی ئەركی بەندایەتیتان، دنیاتان بكەنە باخچەیەك كە لە هەموو لایەكەوە ببینرێت و دەنگی ئاوازی خۆشیی لێوە ببیسترێت، هەوڵی گواستنەوەی شتە دوورەكان بدەن، تا پێی بگەن!".



## ئاگری حەزرەتی ئیبراهیم نەسووتێن و،

## ئاگر کوژێنەرەوەکان!

ئەو ڕۆژە جەژن بوو، گشت خەڵکی شاری نەینەوا (موسڵ) لە شار دەرچوو بوون و ڕوویان لە شوێنی ئاهەنگ گێڕان کردبوو، تەنها حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) لە شار مابووەوە.. ئەمیش تەورێکی هەڵگرت و چوو بۆ (بتخانە)ی شارەکە و، هەموو بتەکانی شکاند، پاشان تەورەکەی برد و دای بە شانی بتە هەرە گەورەکەی بتخانەکەدا.

کاتێك خەڵکی گەڕانەوە شارەکە، چی ببینن؟! سەیریان کرد هەموو بتەکان شکێنراون، تەورێکیش بەدەستی بتە گەورەکەوەیە! لەو کاتەدا هەمووان زانییان کە ئەمە کاری (ئیبراهیم)ە، بۆیە بانگیان کرد بۆ لێپرسینەوە.. بەڵام بەڕاستی حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) بە وەڵامەکانی هەموو خەڵکەکەی بێدەنگ کرد، چونکە وتی:

- ئەوە کاری بتە گەورەکەیە.

- چی! خۆ ئەوە ناتوانێت کاری وا بکات!

- دەی کەوابێت، ئیتر ئێوە بۆچی کڕنووش بۆ شتێکی بێ گیان و بێ دەستەڵات دەبەن؟

لەدواییدا (نەمروود)ی پادشـای وڵاتەکـە، حـەزرەتی (ئیـبراهیم)ی (سەلامی خوای لێ بێت) بانگکرد بۆ لای خۆی و، لێی پرسی:

–ئادەی پێم بڵێ بزانم، خواکەی تۆ کێیە؟

–خوای من (الله)یە، ئەو هەم ژیان دەبەخشێت و، هەم مردنیشـی بەدەستە.

–جا ئەوە چییە؟ منیش ژیـان دەبەخشـم و مردنیشـم بەدەسـتە، ئەگەر بەم کارە ببیت بە خوا ئەوا منیش خوام.

(نەمروود) پاش ئەوەی ئەمەی وت، دوو کەسی هێنا.. یەکێکیانی کوشت و ئەوی دیکەیانی ئازادکرد، بێگومان ئەم کارەی بۆ ئەوە کرد، کە قسەکەی خۆی بسەلمێنێت.

بەڕاسـتی کـارێکی نابـەجێی کـرد! وای دەزانـی بـە نەکوشـتنی کەسـێك ژیـان دەبەخشـێت و، بـە کوشتنیشـی ژیـانی بەدەسـتە، نەیدەزانی کە تەنانەت مردن و ژیانی خۆیشی بەدەست نییـە، یـاخود دەیزانی، بەڵام فیز و خۆبەگەورەزانیی دەنواند.

حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) وتی:

–خوای مـن خـۆر لـە خۆرهەڵاتـەوە هەڵـدەهێنێت، ئەگـەر ڕاسـت دەکەیت، ئەوا فەرموو تۆ لە خۆرئاواوە خۆر هەڵبهێنە.

ئـیتر (نـەمروود) بـەم قسـەیە تـەواو بێچـارە بـوو و، لەبـەردەم دارودەستەکەیدا شەرمەزار بوو.

بەم شێوەیە، هەرچییان دەکرد نەیاندەتوانی حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) بێدەنگ بکەن، هەربۆیە (نەمروود)ی ستەمکار بڕیاری دا بیسووتێنێت! لەبەر ئەوە فەرمانی دا کە ئاگرێکی زۆر گەورە بکرێتەوە و، (مەنجەنیق)ێکی گەورەشی بۆ دروست بکەن.

پاشان حەزرەتی (ئیبراهیم)یان هێنا بۆ نزیکی ئاگرەکە، لەو کاتەدا حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) زۆر لەسەرخۆ بوو و، هەر لەبەر خۆیەوە دەپاڕایەوە.

بە (مەنجەنیق)ەکە حەزرەتی ئیبراهیمیان هەڵ دایە ناو ئاگرە بڵێسەدارەکەوە.. ئا لەم کاتەدا پەروەردگار فەرمانێکی بەئاگرەکە دا:

"ئاگرەکە! سارد بەرەوە و، ببە بە مایەی سەلامەتی و زیان نەگەیشتن بە ئیبراهیم".

بەهۆی ئەم فەرمانەوە ئاگرەکە حەزرەتی ئیبراهیمی نەسووتاند.

ئەم ڕووداوە موعجیزەیەك بوو! واتە دەگونجێت ئاگر مرۆڤ نەسوتێنێت و، دەکرێت جلێکی وەها دروست بکرێت کە بەهۆیەوە مرۆڤ بە ئاگر نەسووتێت.

ئەو پەیامە خواییەی دەکرێت لەڕێی ئەم موعجیزەیەوە لێی تێ بگەین، وەك ئەوەیە کە خوای گەورە پێمان بفەرموویێت:

"مرۆڤەکان، وەك ئیبراهیم بن، بەرگی ئیمان بکەن بە ڕۆحتاندا و لە ئاگری دۆزەخی بیپارێزن، هەندێ کانزا لەسەر زەوی هەن کە دەتوانن ئێوە لە مەترسییەکانی ئاگر بپارێزن!".

ئـەوەتا ئـەمڕۆ لــە هەنـدێ کارگــەی تایبــەت بــە پێداویســتی ئاگرکەوتنەوە، جلوبەرگێکی تایبەتیان دروستکردووە، کە ئـاگر کـاری تێناکات، بەڕاستی ئەم موعجیزەیە ڕێی نیشانی مرۆڤەکان داوە، تا بە دوای پێداویستییەکانیاندا بگەڕێن.[1]

---

١- لە وتەی (بیستەم)ەوە وەرگیراوە.

# سەرەتا ماف و کرێت وەرگرت

## پاشان بەهەشتیشت بە دیاریی بردەوە



بۆچی بەندایەتی دەکەین؟

– بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ پاداشتێك بەدوایدا وەربگرین، یاخود وەك کرێیەکە بەرامبەر بە نیعمەتەکان دەیدەین؟

– وەك کرێیەکە لەبەرامبەر ئەو نیعمەتانەی پێمان بەخشراوە؟!

چۆن؟!

– ئێمە پێشەکی مافی خۆمان بە ئامادەیی کراوەتە دەستەوە و، پێمان بەخشراوە، هەربۆیە پەرستش دەکەین.

– مافی چیمان بە پێشەکی وەرگرتووە؟

– ئەمانە:

یەك:

ئێمە لە بنەڕەتەوە هەر نەبووین، پاشان هێنراوینەتە بوون و، هاتنە دنیامان بە ویست و دەستەلاتی خۆمان نەبووە و، بۆ لەدایکبوونیشمان هیچ ڕەنجێکمان نەداوە، بەڵکو لە نەبوونەوە هێنراوینەتە بوون، ئەمەش مافێکە کە بەپێشەکی پێمان دراوە.

دوو:

دەکرا ببین بە دەنکە چەوێك، یا پارچە دارێك، یاخود بووبووینایە بە مێشوولەیەك، یا کرمێك، تەنانەت پشیلە، یاخود مێش... بەلام نەبووین بەمانە.

– باشە بەرد بۆی هەیە بلێت: "بۆچی نەبووم بە دار؟"، یا مێش بۆی هەیە بلێت: "بۆ منیش مرۆڤ نەبووم؟"

– ئەوان ناتوانن وا بلێن، چونکە ئەو مافەیان نییە.

– بەلام ئەوەتا ئێستا ئێمە بووین بەچی؟

– مرۆڤ!

واتە وەك بوونەوەرێکی کامڵ و تەواو و، شکۆدار و، ژیر و بەختەوەر بەدیهێنراوین.

هەموو شتێك پەیوەندی بە ئێمەوە هەیە، بگرە دنیا و، گەردوون و، دوا ڕۆژ و، بەهەشت و، دۆزەخ هەمووی پەیوەستە بە ئێمەوە.

بەم شێوەیەش مافی مرۆڤبوونمان وەرگرتووە.

سیٚ:

وەك مرۆڤێـك هاتووینەتــە دنیــاوە و دەژیــن، عــەقلٚ و، دلٚ و، هەستەوەر و، دەست و قاچ... چی و چی تریشمان پــێ بەخشــراوە ! جگــە لــەوەش، هــەموو پێداویســتییەکانی ئــەم هەســت و هەستەوەرانەشمان بۆ ئامادەکراون... سەر زەوی سفرەی هـەزارەها جۆر نیعمەتە، ئارەزووت لە هـەر نیعمـەتێك بێـت دەتوانیـت کـەڵکی لێ وەربگریت.

– چـەند دینارمـان داوە بـۆ کڕینـی نیعمەتـەکانی بیرکردنـەوە و، بینین و، بیستن و، بۆنکردن و، قسەکردن و، نانخواردن و خواردنەوە، یان هەر شتێکی تر؟

– هیچ.. یەك (هیچ)ی گەورە ! !

واتە پێشەکی مافی ژیان و خۆشگوزەرانیمان پێ بەخشراوە.

چوار:

– ئێمــە ئــەم جەســتە و هەســتەوەر و نیعمەتانــە چــۆن بەکاردەهێنن؟

بـۆ نموونـە ئەگـەر مۆبایلێك بکـڕین خێـرا ڕێنماییـەکانی چۆنێتی بەکارهێنانی لەسەر پاکەتەکەی دەخوێنینەوە، چونکە گـەر بـە هەڵـە بەکاری بهێـنن تێکدەچـێت و لەکاردەکـەوێت و، بێگومـان زەرەرمەنـد دەبین.

خوای گەورە بۆئەوەی ئێمە فێری شێوازی بەکارهێنانی ئەم نیعمەتانەی بکات، پەرتووکێکی وەك قورئان و، ڕابەرێکی وەك پێغەمبەرﷺ، هەروەها بەرنامە و کەتەلۆگێکی وەك ئیسلامی پێبەخشیووین.

دەتوانین بە پەیڕەوکردنی ڕێنماییەکانی ئایینی ئیسلام، نیعمەتەکانی خوای گەورە بەپێی ویستی زاتی موبارەکی خۆی بەکاربهێنین و، گومانیشمان لەوە نەبێت کە تەنها خوای گەورە خاوەنی هەموو نیعمەتەکانی ئەم گەردوونەیە.



بەمجۆرەش، سەرەتا ماف و کرێی ئیمان هێنان و ئیسلام بوونمان پێ بەخشراوە.

پێنج:

لەگەڵ هەموو ئەم شتانەشدا، بە هەستێکی وا ڕازێنراوینەتەوە، کە مەزنیی و جوانیی تا قیامەت تەواو نابێت، ئەویش (خۆشەویستی)یە.

خۆشەویستی هێندە سفرەیەکی بەرفراوانە و، هێندە خۆشییەکی نەبڕاوەیە و، هێندە ئاسوودەییەکی مەزنە کە وەسفکردنی زەحمەتە و، لە باسکردن نایەت.

ئەگەر باوك و دایك و خۆشك و برا و منداڵەکانمان خۆش نەوێت، ئەگەر خێزان و ماڵ و جوانی و دەورووبەر و مرۆڤەکانمان خۆش نەوێت... ئەگەر دونیا و بوونەوەرەکان و نیعمەتەکانمان خۆش نەوێت... خوانەخواستە و خوا بەدوورمان بگرێت، ئەگەر خودا و پێغەمبەر ﷺ و دین و بەهەشتمان خۆش نەوێت، ئیتر بوون و نەبوونمان چ سوودێکی هەیە؟ یا بەکەڵکی چی دێین؟

کەواتە خوای گەورە نیعمەت لەسەر نیعمەتمان پێ دەبەخشێت، هەرچەندە زۆرکات هەستمان پێ نەکردوون، یاخود هەر بە خەیاڵیشماندا نەهاتوون، بەڵام خودا گەنجینەیەکی زۆر نەبڕاوە و شیرین و بەسوودی پێبەخشیوین.

بەمشێوەیەش، نیعمەتی (خۆشەویستی)مان وەك کرێی پێشەکی پێ بەخشراوە.

وەك بوونەوەرێکی نرخزان و پێزان، ئیتر بەهانەیەکمان ماوە؟ بیانوویەکمان بۆ بێزاری لە نوێژ و، تەمبەڵی لە خواپەرستی و، دوورەپەرێزیی لە پاڕانەوە و هەموو پەرستشەکانی دیکە ماوە؟

ئایا هەست دەکەن ئێمە لەبەرامبەر ئەم هەموو نیعمەتانەدا ئەرکی خۆمان بەجێ هێنابێت؟ گەر دەڵێین: نەخێر، ئەی کەواتە بۆچی هێندە

پەرستشەکانمان لا گرانە؟ یا بۆچی تەمبەڵی دەکەین و بە قورسیان دەزانین؟

کەواتە ئایا بە نوێژ و بەندایەتی کردمان شایستەی چوونە بەهەشت دەبین؟ یاخود ئەوەش هەر دیاری و بەخششێکی خوای گەورەیە و پێویستە لەبەرامبەریدا کار بکەین و، لاساریی نەکەین و، ئەرکی خۆمان وەك مرۆڤ بەجێ بهێنین؟

لە ڕاستیدا تەنها ئەوەنەمان لەدەست دێت کە بڵێین: "پەروەردگار، پێمان ببەخشە!".[1]

---

١- لە وتەی (بیست و چوارەم)ەوە وەرگیراوە.



# دەزنوێژ و نوێژ به یەك كاتژمێر!

"یەك كاتژمێرمان بەسە بۆ كردنی هەر پێنج نوێژە فەرزەكە بە دەزنوێژگرتنیشەوە، كەواتە ئەو كەسەی كە بیست و سێ كاتژمێری تەمەنی لە پێناوی ئەم دنیا فانییەدا بەسەر دەبات و، ئامادە نییە ئەو تەنها كاتژمێرە بۆ ژیانی نەبڕاوەی تەرخان بكات، چەندە زەرەرمەند و بەدبەختە؟ چەندە ستەم لە خۆی دەكات؟ چەندە كارێكی نادروست ئەنجام دەدات؟

(الله أكبر، الله أكبر).. واتە: (خوا گەورەترین و مەزنترین زاتە!).

(أشهد أن لا إله إلا الله)... واتە: (شایەتی دەدەم كە هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە خوای گەورە).

(وأشهد أنَّ محمداً رسولُ الله)... واتە: (شایەتی دەدەم كە موحەممەد نێردراو و پێغەمبەری خوایە).

(حَي على الصلاة)... واتە: (وەرن بۆ نوێژ!)

(حَي على الفلاح)... واتە: (وەرن بۆ ڕزگار بوون و سەرفرازی!)



لەڕۆژێکدا پێنج جار ئەم وشانە لە بڵندگۆی مزگەوتەکانەوە دەوترێن و، گوێمان لێیان دەبێت، کە پێیان دەوترێت (بانگ)، ئەو کەسەش کە ئەم وشانە دەڵێتەوە، پێی دەڵێن بانگبێژ.

بانگبێژ بە ئارەزووی خۆی بانگ نادات، بەڵکو هەر بانگە و کاتی دیاریکراوی خۆی هەیە.

– باشە کێ کاتەکەی دیاریکردووە؟

– خوای گەورە.

– ئەی کێ بانگ دەکرێت؟ یا ئەم بانگکردنە بۆ کێیە؟

– بۆ هەرکەسێکە کە گوێی لە بانگەکە بێت.

– بۆچی بانگ دەکرێین؟

– بۆ نوێژ.

– بۆ کوێ؟

– بۆ مزگەوت.

– بەناوی کێوە بانگهێشت دەکرێین؟

– بەناوی خواوە...

– ڕۆژی چەند جار؟

- پێنج جار: بەیانی و، نیوەڕۆ و، عەسر و، ئێوارە (مەغریب) و، خەوتنان (عیشا)، کەواتە ئەم دەنگە دەنگێکی هەروا ئاسایی نییە و، بانگێکی هەرەمەکی نییە، بانگکەریش خودای پەروەردگار و بەدیهێنەری زەوی و ئاسمانەکانە...

تەنها خوای گەورەمان ئێمە و دنیای بە جوانترین و بێ وێنەترین و وردترین شێوە بەدی هێناوە و، بە هەستە جۆراوجۆرەکان بەختەوەری کردووین، هەروەها دەریایەك نیعمەتی لە ژمارە نەهاتووی بۆ هەڵڕشتووین.

گەر هەرچی دارونەدار و سامانمانە لە پێناو بەدەستهێنانی یەك نیعمەتی زۆر سادە و بچووکدا خەرج بکەین، هێشتا بەتەواوەتی کرێکەیمان نەداوە!

- بۆ نموونە ئەگەر تەنها داوای چاوەکانمان لێبکەن، ئامادەین بە هەموو دنیای بدەین؟

- بەدڵنیاییەوە نەخێر.

ئەو خودایەی کە ئێمەی زۆر خۆشدەوێت، ڕۆژانە پێنج جار بانگمان دەکات بۆ حزوری خۆی، کەواتە بۆچی ئێمە بێ وەستان و بەڕاکردن ناچین بەدەم بانگەکەیەوە؟

ئەگەر بەڕێوەبەری قوتابخانە، یاخود سەرۆکی وڵات بانگمان بکات، یا بنێرێت بەدوامانەدا، کەسمان دەڵێت: "من نایەم، کارم هەیە"؟

- بێگومان نەخێر، تەنانەت ئەگەر لە ڕۆژێکدا مامۆستاکەمان دەجاریش بانگمان بکات هەر دەچین، نە دەڵێین کارمان هەیە، نە هیچ، چونکە خۆمان بە قەرزاری دەزانین، کە زۆر شتی فێرکردووین.

- باشە ئەی پەروەردگارمان؟

با کەمێك بیربکەینەوە و سەرنج بدەین: ئەو زاتە هەموو خۆشەویستەکانمانی پێبەخشیوین و، هەموو پێداویستییەکانمانی دابین و دەستەبەر کردووە.. هەر پەروەردگاری میهرەبانمان بیروهۆش و ژیریی و، ڕۆحمانی پێ بەخشیووین و، لە نیعمەتەکانی خۆی بێ بەشمانی نەکردووە.

بەڕاستی ئێمە بە هەموو شتێکمانەوە قەرزاری ئەو زاتەین، بۆیە هەست ناکەن گەر ڕۆژی سەد جاریش بانگمان بکات، پێویستە بڕۆین بەدەم بانگەوازەکەیەوە؟

ئاخر ئێمەی بەندەی بێ دەسەلات چۆن بتوانین وەفاداریی و بەئەمەکیی خۆمان لەبەرامبەر بچووکترین نیعمەتیشدا بسەلمێنین؟ هەرگیز ناتوانین! بەلام لانی کەم بەم کارەمان خۆشەویستی ئەو زاتە مەزنە بەدەست دەهێنین.

نوێژ وەستانە لە حزوری خوای گەورەدا، بۆیە دۆخەکە شایستەی ئەوەیە پڕجۆش و خرۆش بین بەوەی کە خودای مەزن ئێمەی بانگهێشت کردووە.. بۆ ئەنجامدانی کارێکی هێندە مەزن و

شکۆمەندانەش پێویستە خۆمان پاکوخاوێن کردبێتەوە، ئەمەش بە دەزنوێژگرتن دەبێت.



دەزنوێـــــژ هـــــەم پاکوخاوێنییە بۆ جەستە، هەم پوختەکردن و خاوێنکردنەوەی ڕۆحیشە، واتە بە شێوەیەکی تـا بڵێـی ئاسـان ڕووخسـار و ڕووکەشمان پاك دەکەینەوە.

کاتێکی زۆریشی ناوێت، بۆ نموونە تۆ بۆ دەزنوێژگرتنێك چەندت کات دەوێت؟ ئەوپەڕی (چوار خولەك).

– ئەی نوێژەکان چەندێك کاتیان پێویستە؟

– پێنج نوێژە فەرزەکەمان (١٧) ڕکاتە، کاتی پێویست بۆ هەر پێنج فەرزەکە لەگەڵ کاتی پێویست بۆ دەزنوێژەکانتاندا ئەگەر هەر نوێـژەو چەند خولـەکێکتان پێ بچێت ئەوپەڕی دەکاتە شەست خولەك.

ئیتر (١٣٤٥) خولەکی ڕۆژەکەت بۆ دەمێنێتەوە، کە دەکاتە ٢٣ کاتژمێر.

– بەکورتی دەکاتە یەك کاتژمێر بۆ دوا ڕۆژ و، بیست و سێ کاتژمێر بۆ دنیا؟

ئێستا.. خۆتان بڕیار بدەن و سەرپشك بن: كێ براوەیە؟ یا كێ ژیرانە كاردەكات؟

ئەو كەسەی كە هیچ نەبێت كاتژمێرێكی بۆ دواڕۆژی تەرخان كردووە؟ یان ئەو كەسەی تەنانەت ئەو كاتژمێرەش بەزۆر دەزانێت؟

لە ڕاستیدا گەر پێنج نوێژە فەرزەكەت بكەیت، ئەوا خوای گەورە بە میهرەبانی خۆی كاتەكانی دیكەشت هەروەك نوێژ بۆ هەژمار دەكات، كەواتە بەمەوە كاتی پەرستشت بە (بیست و چوار) كاتژمێری تەواو بۆ دەنووسرێت..

بەم شێوەیە لە ئەنجامدا ئێمە خوامان خۆشویست و، خوداش ئێمەی خۆشویست.. ئایا ئەمە كەمە؟ باشە هێشتا لەوە زیاتر چی دیكەت دەوێت؟[1]

---

١- لە وتەی (چوارەم)ەوە وەرگیراوە.

# نوێژکردن زۆر قورسە؟



ئەرێ پرسیارێك: نوێژکردن شتێکی ماندووکار یا بێزارکارە؟

جارێك کابرایەك پێی وتم:

"ئەزانم نوێژ شتێکی چاك و باشە، بەڵام کە ئاوا قەت تەواو نابێت و، ئەبێت هەموو ڕۆژێ پێنج جار دووبارەی بکەیتەوە، بێزارت دەکات".

دوای ماوەیەك بەسەر قسەکانی ئەو پیاوەدا، ڕۆژێك گوێم لە نەفسی خۆم گرت و، گوێم لێبوو کە نەفسیشم هەمان قسەی دەکردەوە..

منیش تەماشایەکی نەفسی خۆمم کرد، بینیم وا بە تەمبەڵیی گوێ لە شەیتان دەگرێت، ئەو کات تێگەیشتم، کە لە ڕاستیدا ئەو پیاوە قسەکەی بە ناوی هەموو (نەفس)ەکانەوە کردووە.

ئـەو کـات منـیش وتم: مـادەم نەفسـم مـن بـۆ لای بـیری خـراپ ڕادەکێشێت، دەبێت سەرەتا لە خۆمـەوە دەسـتپێبکەم، چونکە هـەر کەس نەفسی خۆی چاك نەکات، ڕێی سەرفرازیی بۆ نادۆزرێتەوە.

وەڵامێك بۆ (نەفس)م:

ئەی نەفس! ئەم قسەیە قسەیەکی نەفامانەیە و، بۆنی تەمبـەڵیی لێدێت، کە بێ بیرکردنەوە و هەروا بە هەڕەمەکی وتراوە.

ئەی نەفسی هەژارم، ئاخۆ تاهەتایە دەژیـت؟ بەتـەمای نـەمریت؟ تـا چـەند دڵنیایـت کـە تـا سـاتێکی دیکـە، یـا تـا سـبەی لـە ژیانـدا دەمێنیت؟

ئەو شتەی تۆی بێزار کردووە و بێتاقەتی کردوویت، لـە بنەڕەتـدا هۆکارێکە بۆ دۆزینەوەی ڕێی ئازادی و سـەرفرازی دوا ڕۆژ، مەگـەر تـۆ دواڕۆژت مسۆگەر کردووە، وا ئاوا دەکەیت؟!

ئەگەر لەوە بگەیشـتیتایە کـە ژیـانی دنیـا فـانی و بڕاوەیـە، ئـەوا بێگومـان یـەك لەسـەر بیستوچـواری تەمـەنت بـۆ دواڕۆژت تـەرخان دەکرد.

نوێژ پەرستشێکی زۆر جوان و ئارامبەخشە و، تا بڵێیـت ئاسـان و چێژبەخشە و، بێزاری هەر ناهێڵێت و، دڵ و دەروونی مـرۆڤ بەتـەواوی ئاسودە دەکات.

**یەکەم ئاگادارکردنەوە:**

ئەی نەفسی تەمبەڵم، هەموو ڕۆژێک نان دەخۆیت و، ئاو دەخۆیتەوە و، هەوا هەڵدەمژی.. ئەمانە بێزارت ناکەن؟

بێگومان بێزارت ناکەن، چونکە ئەمانە پێویستیی بەردەوامیی ژیانی تۆن، بگرە هەموو ڕۆژێك چێژیشیان لێ دەبینیت.

خۆراکی دڵ و ڕۆح و خۆشبەختیشت نوێژکردنە، کەواتە چۆن دەبێت بێزارت بکات؟ یان ڕاستتر بڵێین: نابێت بێزاربیت بە دەستییەوە.

- باشە بۆ کردنی پێنج نوێژە فەرزەکە چەند کاتژمێرم پێ دەچێت! نوێژە فەرزەکان چەند دانەن؟

- پێنج دانە: بەیانی، نیوەڕۆ، عەسر، ئێوارە، خەوتنان.

- بەهەمووی چەند ڕکاتە؟

- حەڤدە ڕکات.

- پێنج نوێژە فەرزەکە لە ماوەی چەند خولەکدا دەکرێت؟

- کاتی پێویست بۆ ئەنجامدانی هەر پێنج نوێژە فەرزەکە بە دەستنوێژیشەوە بەنزیکەیی دەکاتە یەك کاتژمێر، لە ڕۆژێکی تۆ.

- ڕۆژێك چەند کاتژمێرە؟

- بیستوچوار کاتژمێرە.

کەواتە گەر ڕۆژی کاتژمێرێك بۆ نوێژەکانمان تەرخان بکەین، بیستوسێ کاتژمێری تەواومان بۆ دەمێنێتەوە.



بیستوسیٚ کاتژمێر!

لـــەم کاتـــەدا بخـــۆ، بخۆرەوە، بخـەوە، کاربکـە، پشوو بدە، بخوێنە، بنووسـە، گەشـــت بکـــە، بـــەکورتی هەرچییەك دەکەیت ئازادیت، بەڵام هەوڵ بدە کاتژمێرێکیش بـــۆ نوێـــژەکانت تـــەرخان بکەیت.

ئیتر خۆ زەحمەت نییە، وانیە؟ ئەگەر بە پێچەوانەوە بوایـە، زۆر قـــورس دەبـــوو، مەبەســـتم ئەوەیـە گـەر ڕۆژی بیستوسیٚ کاتژمێر نوێژ و یەك کاتژمێرت بۆ بمایەتەوە، ئەوا ئەو کات بەڕاستی بارێکی سەخت دەبوو.[1]

---

١- لە وتەی (بیست و یەکەم)ەوە وەرگیراوە.



# چەند ساڵ نوێژ دەکەین؟

ڕەنگە بپرسن:

"چەند ساڵ دەژین؟".

– مرۆڤی ئاسایی و تەندروست ئەوپەڕی سەد ساڵ دەژی، کەسیش لەوە زیاتری ناوێت.

– ئەیَ کەی دەمرین؟

– خوا دەزانێت.

– کاتژمێرێکی کە؟ ئەمڕۆ؟ بەیانی؟ ساڵێکی تر؟ دەساڵی دیکە؟ یان چل ساڵی تر؟ کەس ناتوانێت ڕۆژ و سەعاتێك دیاری بکات، وانییە؟

– بابڵێین لە دە ساڵییەوە دەستت بە نوێژکردن کردووە و، ئێستا دوانزە ساڵانیت، واتە دوو ساڵ نوێژت کردووە، باشە هێشتا قورسایی ئەو نوێژانەی کردووتە بەسەر شانتەوەن؟

بەدڵنیاییەوە نەخێر، ئێمە خۆشبەختییەکەیمان لە دڵماندا هەڵگرتووە، نەك بارگرانی و قورسیەکەی، چونکە لەو دوو ساڵەدا کارێکی زۆر چاکمان ئەنجامداوە، ئێستا تەنها خۆشییەکەی لە دڵماندا ماوەتەوە.

کەواتە ئەو نوێژانەی دەیانکەین هیچ ئاسەوارێکی بارگرانی لەسەر تەندروستیمان جێ ناهێڵن.

– تا چەندێکی تر ئەبێ نوێژ بکەین؟ یەك فەرزی کە؟ پێنج فەرزی کە؟ پەنجا فەرزی کە؟ یاخود تا دەساڵ یان تا چل ساڵی دیکە؟

– ئەم پرسیارە زیاتر لەو پرسیارە دەچێت کە دەڵێت: "کەی دەمرین؟"

هیچ کەس ناتوانێت وەڵامێکی تەواوی ئەم پرسیارە بداتەوە.

ڕەنگە لەهەر چرکەیەکدا، یاخود هەر کاتژمێرێکدا بمریت، گەر وا بێت چەند فەرزی دیکەش دەکەیت؟

یەك فەز، وانییە؟ ئەویش ئەو نوێژەیە کە ئێستا کاتی هاتووە، بۆ نموونە با بڵێین نوێژی نیوەڕۆیە.

پاش ئەوەی ئەم نوێژەمان کرد، کەسمان دڵنیا نین کە زیندوو دەمێنینەوە تا نوێژێکی دیکەش بکەین.

گەر خۆمان لەسەر ئەوە ڕابهێنین کە ڕەنگە لە هەر ساتێکدا بمرین و دەرفەتی دیکەمان لەبەردەستدا نەبێت، ئەوا تووشی هیچ بێزاری و بێتاقەتییەك نابین لەبارەی نوێژەکانمانەوە.[١]

---

١– لە وتەی (بیست و یەکەم)ەوە وەرگیراوە.

# نوێژ پێویستییەکی ژیانە



لەڕۆژێکدا چی دەکەین؟

سێ ژەم نان دەخۆین.

لانی کەم دەجار ئاو دەخۆینەوە.

لەهەر خولەکێکدا بیست جار هەناسە هەڵدەمژین و دەیدەینـەوە،

هەروەها دەجار چاومان دەتروکێنین.

هەشت نۆ کاتژمێر دەخەوین.

دەتوانین چەندین کاتژمێر قسەبکەین.

سی چل جار هەڵدەستین و دادەنیشینەوە.

چل پەنجا جار پێدەکەنین.

چی و چی تریش دەکەین؟

کەچی لە هیچ کام لەمانە بێزار نابین، وەڕس نابین، هیلاك نابین..

بۆچی؟

چـونکە هەریەکـەیان پێویسـتییەکن و، بـۆ بـەردەوامیی دان بـە ژیانمان پێویستمان بە ئەنجامدانیان دەبێت.

لەلایەکی دیکەشەوە، ئێمە تەنها جەستەیەك نـین کـە لـە گـەدە و دەم و زمان و چاو و دەست و قاچ پێکهاتبین و، زینـدەوەرێکی سـڕ و بێ هەستیش نین.

بەدڵنیاییەوە پشیلەش نین، هەر کە ورگمان تێرکرد، خێـرا بچـینە سووچێکەوە و لێی بخەوین.

هەست و سۆزمان هەیە، دڵ و ڕۆح و عەقڵ و، لایەنی دەروونیمان هەیە.. ئەمانە ئەو تایبەتمەندییانەن کـە ئێمـە لـە بوونـەوەرانی دیکـە جیادەکەنەوە.

هەروەك چۆن گەدەمان پێویستی بە خۆراکە، بە هەمان شێوە دڵ و عەقڵ و ڕۆح و دەروونیشمان پێویسـتی بـە خۆراکـە، خـۆ نابێـت بـە برسێتـی وازیان لێ بهێنن، بەڵکو پێویستە ئەوانیش تێربکەین.

- باشە چی بدەین بە دڵمان؟ گەر کفتەی بدەینێ ڕازی دەبێت؟

ئەی چی دەرخواردی عەقڵمان بدەین؟ تۆ بڵێی حەزی لە پـاقلاوە بێت؟

ڕۆحمـان بەچـی بـەخێو بکـەین؟ گـەر نەسـتەلەی بـدەینێ ڕازی دەبێت؟

- نەخێر، هیچ کامیان نابێت...

هەندێ جار وا بێتاقەت دەبین، خەریکە شەق بەرین.. جاری واش هەیە، دڵمان تەنگ دەبێت و، ڕووخسارمان بێ شەوق و زەوق دەبێت و ڕەنگی مردوو دەگرین.

هەندێ جاریش مێشکمان ماندوو دەبێت و، دنیامان لا بەرتەسک دەبێتەوە و، هەر چییەك بکەین ئەم هەستەمان لەکۆڵ نابێتەوە، بەهیچیش ئارام نابینەوە.

– باشە ڕۆح و گیانمان هی کێیە؟ هی خۆمانە؟

– نەخێر، هی بەدیهێنەرمانە.

– دڵمان هی کێیە، هی خۆمانە؟

– نەخێر، ئەویش هەر هی ئەو زاتەیە؟

– ئەی عەقڵمان هی کێیە؟ ئەمیشیان هی خۆمان نییە؟

– ئەویش هەر هی ئەو زاتەیە.



– گەر وابێت دەبێت چی بکەین؟

– تەنها یەك کارمان لەدەستدێت، هەر کە بانگی فەرموو، یەکسەر بچین دەستنوێژێکی پاك و پوخت بگرین و، لەڕێی نوێژەوە بچینە

حزووری ئەو پەروەردگارە مەزنەمان.

پێویستە ڕووبکەینە ئەو خوایەی کە ئێمەی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون و، ژیاندووینی و، پێویستییەکانی بۆ دابین کردووین.. ئەو زاتەی ئێمە دەبینێت و، دەماننناسێت و، خۆشی دەوێین، دەمانژیەنێت...

گەر نوێژەکەمان بەمشێوەیە کرد، ئەوا ئەو کات دەبینین هیچ برسێتییەك نامێنێت، یا هیچ پێویستییەك نامێنێت کە پێت نەبەخشرێت.

ناڕەحەتییەکان نامێنن، چێژ و خۆشی لە جێیان سەر هەڵ دەدات، هەموو تارکییەکان دەبن بە ڕۆشنایی.

ئا لەو کاتەشدا دڵ و ڕۆح و عەقڵمان تێر دەخۆن.[1]

---

١- لە وتەی (بیست و یەکەم)ەوە وەرگیراوە.



# نوێژکردن

## چ سوودێکمان پێ دەگەیەنێت؟

ئەگەر پێت بڵێن: "ها ئەو پارەیە بگرە، بەس دانیشە ئەو ئیشەمان بۆ بکە!". بەخۆشحاڵییەوە کارەکە ئەنجام دەدەیت.

کاتێك کاردەکەین هەرگیز بێزار دەبین؟ باشە هەراسانیی و وەڕس بوونمان دەردەبڕین؟

بێگومان نەخێر..

– بۆچی؟

– چونکە چاوت لە کرێکەتە.

خۆ ئەگەر ڕۆژێك بێن هەڕەشەت لێبکەن، بۆ نموونە بتترسێنن و بڵێن: گەر تا ئێوارە کارنەکەیت، ئەوا لێپرسینەوەت لەگەڵ دەکەین، ئیتر تۆیش لەم بارەدا بێ ڕەخنە و گلەیی ئیشەکەت بەو شێوەیە ئەنجام دەدەیت.

– بۆچی؟

– چونکە هەستت بە مەترسی لەدەستدانی کار و بژێوی ژیانت کرد!

دەی خوای گەورە لە پێشدا کرێکەتی پێ داویت.

- چۆن؟

- نوێژ، پەرستشێکە کە دڵ و ڕۆحمان پێی پەروەردە دەبێت.

گەر نوێژ بکەین، هەست بە ئاسوودەیی دەکەین، ناخمان ئارام دەبێتەوە، ڕۆحمان هەناسەیەکی بەبەردا دێتەوە و، پشوویەك دەدات، ئەمەش کرێکەمانە لە دنیادا..

- ئەی لە قیامەتدا، لە دوارۆژدا چی چاوەڕێمانە؟ لە گۆڕەکەماندا خۆراك و شتمان پێدەدرێت؟

بمانەوێ و نەمانەوێ، درەنگ یان زوو، پیر بین یان گەنج، ژیانی دنیامان تەواو دەبێت و، ژیانی نەبڕاوەمان دەستپێدەکات، یەکەم وێستگەش گۆڕە، کە تا هەڵسانی قیامەت تێیدا دەمێنینەوە، خۆراکەکەشت لەوێدا، دەرەنجامی ئەو نوێژانەیە کە لە ژیانتدا کردووتن.

بەیەك فەرمانی خوای گەورە هەموومان زیندوو دەبینەوە و، لە گۆڕەکانمان دێینە دەرەوە، لە ساحەی مەحشەری جێی کۆبوونەوەی هەموو مرۆڤەکاندا کۆدەبینەوە.. پاشان لەوێ دادگایەکی گەورە سازدەکرێت و، هەمووومان لێپرسینەوەمان لەگەڵدا دەکرێت.

نوێژ لەو کاتەدا بەفریامان دەگات.. لەم دادگاییەدا نوێژەکانمان دەکەینە بەڵگەیەك تا خۆمانی پێ ڕزگار بکەین، لێرەدا ڕاستگۆیی و ناڕاستگۆییشمان ئاشکرا دەکرێت..

لەدوای ئەمە دەچینە سەر پردی (سیرات)، کە لەسەر (دۆزەخ)ە، لێرەشدا نوێژەکانمان وەك ئەسپێکی جوان و ئازا دێت و دەمان پەڕێنێتەوە.

کاتێك هەموو ئەم قۆناغانەمان تێپەڕاند، ئیتر ڕێگەی بەهەشت دێتە پێشەوە.. خوای گەورەش بەڵێنی بە نوێژکەران داوە بەهەشت بکاتە نسیبیان.. بەم شێوەیەش تاهەتایە لەوێدا دەمێنینەوە.

ئیتر لە بەرامبەر ئەو نوێژانەماندا کرێی بەهەشت بەدەست دەهێنین.

پاش ئەوەی بەیەکەوە ئەم هەموو زانیارییە دڵخۆشکەرانەمان زانی، ئیتر دەشێت کەسمان نوێژەکانی فەرامۆش بکات؟

سەودا و مامەڵە و کار و بازرگانی لەمە باشتر دەبێت؟ بێگومان نەخێر.

چ خۆشبەختیەکە!

بابەتی نوێژکردن ڕوویەکی دیکەشی هەیە..

ئەگەر پێت بڵێن: "گەر ئەو تاوانە بکەیت، ئەوا دەبێت ئەوەندە ساڵ لە زینداندا ژیانت بەریتە سەر"، ئەوا بێگومان لە ترسی زیندان ئەو تاوانە ئەنجام نادەیت.. نوێژکردنیش فەرمانێکی خودایە،



نەکردنیشی بەرەنگاربوونەوە و ڕەتکردنەوەی فەرمانێکی خودایە و (تاوان)ە.

چۆن خودا بەڵێنی بەهەشتی بە نوێژکەران داوە، هەر بەو جۆرەش سزای ئاگری دۆزەخیشی بۆ فەرامۆشکەرانی داناوە.

باشە کە ئێمە بۆ ئەوەی چەند ساڵێك لە زیندانێکی دنیادا نەمێنینەوە، یاسا و ڕێساکان جێبەجێ دەکەین، کەواتە بۆچی ناتوانین بۆ خۆپاراستن لە (زیندانی تاهەتایی دۆزەخ) نوێژەکانمان بکەین؟![1]

---

١- لە وتەی (بیست و یەکەم)ەوە وەرگیراوە.

# کاتێك بۆ نوێژکردن نادۆزیتەوە؟



دایکت ئاگادارت دەکاتەوە و، پێت دەڵێت:

–کچم، نوێژی ئێوارەت کرد؟

وەڵامەکەت بەم شێوەیە دەبێت:

–نەخێر، لەبەر سەعیکردن نەمتوانی.

–چاوەڕێی تەواوبوونی ئەو فلیمەم کرد.

–لەگەڵ هاوڕێکانمدا سەرقاڵی قسەکردن بووین.

باوکت بیرت دەخاتەوە و، دەڵێت:

–کوڕەکەم (نوێژی عیشا)ت کرد؟

وەڵامەکەت بەم شێوەیە دەبێت:

– نا، زۆر هیلاك و سەرقاڵم، مەجالی سەرخوراندنیشم نییە.

–ئاهـ، هێشتا یارییەکە تەواو نەبووە.

–بەیانی تاقیکردنەوەیەکی زۆر قورسم هەیە.

ئـيتر ئەمــە نموونــەی چــەند بيانوويەكـە كـە دەيهێنينــەوە و، هەركەسە و بە گوێرەی خۆی بيانووی لەم چەشنە ڕێكدەخات...

تەنانەت جاری وا هەيە باوكيش بيانووی خۆی هەيە بۆ پشتگوێ خستنی نوێژەكەی، وەك:

- "ئەمڕۆ هەر خەريكی ڕاكەڕاك بووم، ئـيتر مـەجالی نوێـژ چۆن بمێنێتەوە؟"، "ئيتر بـەزم و ڕەزمـی كـار و كاسـپی و گوزەرانـە، خـۆ دەقەيەك لە ڕەنجكێشان ناسرەوم، فريای نانخواردنيش ناكەوم"، "با هەواڵەكانم لەدەست نەچێت، خـۆ ئـەبێ بـزانم دەنگوباسـی ئـەم وڵاتـە چيە و، چ باسە!".

لە ڕاستيدا ئەم باوكانەش لەبەر ئەوەی ڕۆژانە بە كـار و كاسـپی و دابينكردنــی بژێوييــەوە زۆر ســەرقاڵ و مانــدوو دەبــن، هەميشــە نوێژەكانيان كۆتا شتە كە بێت بە خەياڵياندا!

- ئەی دايكان؟

- ئيشی ئەوان، خۆ هەرگيز تەواو نابێت، بۆيە دەبينيت دەڵێن: "تا ئێوارە خەريكی جل شتن و قاپ شـتن و ماڵپاكردنـەوە بـووم، ئيشێ تەواو ئەبێ، ڕاكە بۆ ئيشێكی تـر"، يـا "خـۆ لەبـەر قسەوباسـی ژنەكەی دراوسێمان سەرم ناپەرژێتە هيچ، ماشەڵا خۆش قسـەيە"، يـا "ئەم كەناڵە تەلەفزيۆنانەش ئەوەندە بەرنامەی سەير و خۆش پـەخش دەكەن!"

هەرکەسەو بەپێی کاری خۆی -بە ئارەزووی خۆی- بیانوو و پاساو دێنێتەوە، باشە قابیلە مرۆڤ بۆ کارکردن و ڕاکەڕاکە هاتبێتە ئەم دنیایەوە؟ یا هەر ڕۆژەکانی بەڕێبکات و تەمەن بگوزەرێنێت و، چی پێ خۆش بوو بیکات، دواتریش بمرێت و ژیانی دنیا جێ بهێڵێت؟! جا چۆن شتی وا دەبێت؟

خۆ هەموو ئەم کارانە چۆلەکەش ئەنجامیان دەدات، ئەوەتا ئەو چۆلەکەیە دوو سێ کاری هەیە و تەواو، بۆ نموونە بفڕێ و بنیشێتەوە، بگەڕێ و بە ئاسماندا گەشت بکات، خۆی تێربکات و، کە بوو بە شەو بگەڕێتەوە هێلانەکەی.

– ئایا ئەشێت مرۆڤیش ئاوا بێت؟

– تەنها ئەنجامدانی کارە دووبارەکانی ڕۆژانە و، تێرکردنی ورگی و، تەواوکردنی ئەرکەکانی لەسەرە؟!

– بەدڵنیاییەوە نەخێر، بەڵکو مرۆڤ لەپاش مردن داهاتوویەکی پرشنگدار و شکۆمەند و، ژیانێکی تاهەتایی چاوەڕێیەتی، کە نابێت فەرامۆشی بکات.

پێویستە ئامادەکاری بکات بۆ ئەو داهاتووە و، نابێت ئەوەندە بە دنیایەوە سەرقاڵ بێت، دواڕۆژی تێکبدات و خۆی چارەڕەش بکات و، تەنها پێداویستییە مادییەکانی جەستەی دابین بکات و لایەنی دەروونی و ڕۆشنبیریی وەلابنێت، گەرنا گیرفان پڕی ئەم دنیا و مایەپووچ و هەژاری قیامەت دەبێت.

مرۆڤـی بەسـتەزمان! پێـت وایـە تـەنها بـۆ ژیـانی دنیـا بـەدی هێنراویت، وا ئاوا هەموو ژیانـــت بـــۆ تـــەرخان کردووە؟



خۆئەگەر لە دنیاشدا بـەو شـتانەوە سـەرقاڵ بیـت کـە پێشـــتر باسمـــانکرد، ئـــەوا لـــە بنەڕەتەوە زۆربەیان لـە دەسـتی خۆتـدا نین یـا پەیوەنـدیان بـەتۆوە نییـە، کەواتـە لەشـتی بێ کەڵکدا خـۆت سەرقاڵ دەکەیت.

ئـەو شـتەی کـە زۆر گـرنگ و پێویسـتە بـۆ داهـاتووت فەرامۆشـی دەکەیت، بۆ وادەزانیت هەزاران ساڵ دەژیت، وا ئاوا خۆت بەشتی بـێ ماناوە خەریك کردووە؟![1]

---

١- لە وتەی (یەکەم)ەوە وەرگیراوە.



## بەرەکەتی نوێژی

## مرۆڤی ئیشکەر و کارزان

یەکێك لە بیانووەکانی ئەو کەسانەی نوێژ ناکەن، ئەوەیە کە دەڵێن: "باوەڕکە، ئەوەی منی لە نوێژ دابڕیوە هەروا شتێکی بێ مانا نییە، ئاخر من بەخێوکردنی خێزانێکم لەئەستۆیە، ناچارم کاربکەم، هیچ مەجالی نوێژکردنم نییە".

سەرەتا با سەرنج لەم نموونەیە بدەین:

گەر بە کرێیەکی (دەهەزار دینار)ی ڕۆژانە لە شوێنێك کارت دەکرد، بەڵام یەکێك هات بۆ لات و پێی وتی: "وەرە دە خولەکێك ئێرەم بۆ هەڵکەنە، ئەڵماسێك -کە بە دە ملیۆن دۆلارە- دەدۆزیتەوە"، کەچی تۆ بڵێیت: "نا، نایەم، چونکە بایی ئەو دە خولەکە لە کرێی ڕۆژانەکەم کەم دەبێتەوە"، ئەم قسەیە نەزانی و ساویلکەیی نابێت؟!

هەروەك لە نموونەکەدا هاتووە، گەر تۆ لە باخچەیەکدا بۆ گوزەرانی خۆت کاربکەیت، بەڵام نوێژەکانت نەکەیت، ئەوا هەموو ڕەنجەکەت تەنها بۆ دنیا دەبێت، ئەمەش واتای کارێکی بێبەرەکەتە...

خۆئەگەر بۆ ماوەیەکی کورت دەست لە کارەکەت هەڵگریت و، کەمێك پشوو بەدڵ و ڕۆحت بدەیت لە ڕێی نوێژەکانتەوە، ئەوا تۆ دووجار قازانج دەکەیت.

یەکەم قازانج ئەوەیە، کە تۆش وەك دار و درەخت و گوڵ و سەرجەم ڕووەکەکانی باخچەکە زیکر و یادی خوا دەکەیت، کە لەبەرامبەردا پاداشتت بۆ دەنووسرێت، چونکە دەزانین ڕووەکانیش بەشێوازێکی تایبەت بە خۆیان بەردەوام یادی خوا دەکەن.

دووەم قازانج ئەوەیە؛ کە هەر بەروبوومێك لەم باخەدا بەرهەم بێت و، هەر شتێك بیخوات جا ئەگەر ئاژەڵێك بێت، یان مرۆڤێك، یان کەسێك بیکڕێت، تۆ بەئەندازەی ئەو بەروبوومانە بە خێر و چاکە بۆت دەنووسرێت و، پاداشتی لەسەر وەردەگریت.[١]

---

١- لە وتەی (بیست و یەکەم)ەوە وەرگیراوە.

# وەسوەسەی لە نوێژ ساردکردنەوە



کاتێك بۆ نوێژکردن دەوەستم، شتی زۆر خراپ دێت بەخەیاڵمدا، بەم حاڵەوە چۆن نوێژبکەم؟

هەموومان بەم دەردەوە دەناڵێنین، کاتێك بۆ نوێژ ڕادەوەستین ئیتر شتی خراپ و نەشیاو دێت بە خەیاڵماندا و، دڵمان دەگرێت و، بیروهۆشمان پەرتەوازە دەکات و، ئاگامان لای نوێژەکەمان نامێنێت.

ئیتر خۆمان تاوانبار دەکەین و بە سەرسامییەوە دەڵێین: "دڵم چەند بەدخوو بووە!"، بۆ خۆپزگارکردنیش لەم هەستە، نوێژەکە دەبڕین، ئیتر لە ناخەوە ساردبوونەوەیەك بەرامبەر بە نوێژەکانمان سەرهەڵدەدات، هەندێ جار نوێژەکەمان بە بەتاڵ دەزانین، بۆیە سەرلەنوێ دەیکەینەوە، جاری واش دەبێت کە هەزار جار لە نوێژەکەمان پەشیمان دەبینەوە.

ئامان وریا بن! ئەم خەیاڵانە لە لایەن شەیتانەوەیە، کە هەر لەگەڵ وەستانماندا بۆ نوێژ خەریکی سەرقاڵکردنمانە تا لە نوێژ دەبینەوە، تەنها بۆ ئەوەی وەسوەسەمان لا دروستبکات.

وەسوەسە وتەی شەیتانە، ئەگەر نا ئەم شتانە لە ناخ و دڵی ئێمەوە سەرچاوە ناگرن.

وەسوەسە نەخۆشییەکی خەیاڵییە، واتە لەگەڵ ڕاوەستانمان بۆ نوێژ شەیتان شتی سەیر و سەمەرە بە خەیاڵماندا دەهێنێت.

هەستی خەیاڵ وەك ئاوێنەیەکە، هەموو چەشنە وێنەیەك لە خۆدەگرێت، بیر و هۆشمان بەلای نوێژەکەمانەوە ناهێڵێت و، پەرتەوازەی دەکات.

– ئەی چار چییە؟

– با ئەمجارەیان بەم قسە ناشیرین و وێنە نابەجێیانەی کە هی شەیتانن نەپەشۆکێین، چونکە دەبینین دڵی ئێمە لە دەست ئەم دۆخە ناڕەحەتە، کەواتە لەدڵی خۆمانەوە نییە.

– باشە لە کوێوە دێن؟

– لەشوێنێکی نزیك دڵەوە کۆنترۆڵی شەیتانی لێیە، بەگشتی لە دڵدا کەمێك وەسوەسە هەن و، سەرەتا هیچ زیانێکیان نییە، بەڵام هەر کاتێك شەیتان هەستی کرد زیانمان پێ دەگەیەنن، ئەوا ئەو کات دەستی خۆی دەوەشێنێت و، لە ناخماندا زۆری دەکات.

ئەو وشە و وێنە ناشیرینانەی لە ئاوێنەی خەیاڵماندا دەیانبینین هیچ زیانێکیان نییە بۆمان و، لە ئاگری ناو تەلەفزیۆن دەچن، خۆ وەك هەمووومان دەزانین تەنها وێنە و ڕواڵەتی ئاگر سوتێنەر نییە، یان وەسوەسە لەو مارە دەچێت کە لە تەلەفزیۆنەکەدا دەیبینین و هیچ زیانێکی بۆمان نییە، یان لە وێنەیەکی ناشیرین و سپی دەچێت کە لە تەلەفزیۆن یا کامێراکەماندا هەیە و، پێویست بە شۆردنەوە ناکات.

– بۆ ئەوەی ئەو وشە ناشیرین و وێنە ناشیرینانەی کە لە نوێژدا دێن بە خەیاڵماندا هیچ زیانێك بە نوێژەکەمان نەگەیەنن و، بیرمان نەوروژێنن و، بەهۆیانەوە نوێژەکەمان لێ تێك نەچێت، پێویستە چی بکەین؟ واتە ڕێگە چارە چییە؟



– گرنگی بەم بیرە خراپانە نادەین و، بە جددی وەریان ناگرین و، لەبەرچاومان گەورەیان ناکەین، لێشیان ناترسین و، پەسەندیان ناکەین، بۆ ئەوەی بە خەیاڵی بێ بنەما و خراپ خۆمان لە بەرگی خەمەوە نەئاڵێنین.[1]

---

١– لە وتەی (بیست و یەکەم)ەوە وەرگیراوە.

"نوێـژ نـاوەڕۆکی نـوورانیی گشـت پەرستشـەکانە و، نەخشـەی شێوازی بەندایەتی کردنی گشت بوونەوەرانە".

نوێژ ناوەڕۆك و پوختەی پێرستی گشت پەرستشەکانە، واتە لەناو نوێـژدا گشـت پەرستشـەکانی دیکـە دەبینینـەوە، چـونکە هـەموو شێوازێکی بەندایەتی لەناو نوێژدا هەیە.



## واتە لەنوێژدا بەڕۆژوو دەبین؟!

– مەبەستت ئەوەیە لەدوای دەستپێکردنی نوێژ ئیتر بەڕۆژوو دەبین؟!

– لەکاتی ڕۆژووگرتندا هەرچییەکمان لێ قەدەغەیە، لە نوێژیشدا بەهەمان شێوە لێمان قەدەغەکراوە، واتە ناخۆین و ناخۆینەوە، قسە –چاك بێ یا خراپ– ناکەین، بەسەر ئارەزوو و وەسوەسەکاندا زاڵدەبین.

تەنانەت لە کاتی نوێژدا ڕۆژووی بێدەنگیش دەگرین، چونکە لەگەڵ هیچ کەسێکدا قسە ناکەین و، وەڵامی کەسیش نادەینەوە، واتە جگە لە خوێندنی قورئان و زیکر هیچ شتێکی دیکە لە زارمان دەرناچێت.

لەوەش زیاتر، بەجۆرێك چاو و گوێچکەشمان بەڕۆژوو دەبن، کە نەك تەنها چاومان لە دیمەنی ناحەز و دەوروبەر دەپارێزین، بەڵکو بە هیچ شێوەیەك بەلای ڕاست و چەپیشدا ناڕوانین.

گوێمان لە دەنگ و مۆسیقایەك دەپارێزین كە گومانی دروستكردنی خەیاڵاتی خراپی لێبكەین، هەر بۆیە گەر بمانەوێت نوێژێكی ئاسوودەكار و ئارامبەخش بكەین، پێویستە شوێنێكی بێدەنگ هەڵ بژێرین بۆ نوێژكردنمان.

لەكاتی نوێژكردندا هەندێك لە هەستەكانیشمان بەڕۆژوو دەبن و، خۆمان لە بیر و خەیاڵی خراپە بەدوور دەگرین، بەم جۆرەش عەقڵ و مێشكمان بە ڕۆژوو دەبن.. گەر بەتەواوی بەسەر هەمووشیاندا زاڵ



نـەبین، لانـی کـەم بـیر و هۆشمـان لای نوێژەکـەمان دەمێنێتـەوە و دەرفەتی پەرتەوازەبوونی بۆ نامێنێتـەوە، کەواتـە هـەر بەڕاستی لـە نوێژکردندا واتای ڕۆژووگرتنێکی زۆر جوانیش هەیە.

## لە نوێژدا زەکات دەدەین؟

زەکـات، بریتییـە لـە بەخشـینی بەشـێك لـە نیعمەتـەکانی خـوای گەورە لە پێناو بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی ئەو زاتەدا، ئەمـەش واتـای ئەوەی کە بەخشینی زەکات تەنها لەماڵ و ساماندا نییە.

لەشسـاغی نیعمەتێکـە، بۆیـە باشـترین ڕێگـەی بـەکارهێنانی ئـەم نیعمەتە لە پێناوی خودادا، بە نوێژکردن دەبێت.

ڕاوەستان و، چەمینەوە (الرکوع) و، کڕنوش بردنمان (السجود) لە نوێژدا بە جێگەیاندنی فەرمانی خوایە، کەواتە هەر یەکەشیان بریتییـە لە زەکاتدان لە لەشساغیمان.

## لەنوێژدا دەچین بۆ حەج؟

یەکێك لە مەرجەکانی حەجکردن سوڕانەوە (تـەواف)ە بـەدەوری کەعبەدا، ئێمەش کاتێك لە نوێـژدا ڕادەوەستین، ڕوودەکەینـە قیبلـە، قیبلەش کەعبەی پیرۆزە، کەواتە لە نوێژکردندا حەجیشمان ئەنجامدا.

## لەنوێژدا قورئان دەخوێنین؟

قورئان خوێندن پەرستشێکی گرنگە و، کارێکی پڕ خێرە، یەکێك لە مەرجەکانی نوێژکردنیش خوێندنی قورئانی پیرۆزە.

لە هەموو ڕکاتێکدا سورەتی (ئەلفاتیحە) دەخوێنین، لە دوای ئەوەش هەرکەس چەند ئارەزووی لێبوو دەتوانێت قورئان بخوێنێت، کەواتە لە نوێژکردنەوە پاداشتی قورئان خوێندنیشمان بۆ دەنووسرێت.

هەموو پەرستشەکان -هەروەك ئەوانەی باسمان کرد- لە نوێژدا هەن، واتە ئەگەر نوێژکەرێك بڵێت: "من هەموو پەرستشەکانم، ئەنجامداوە، درۆی نەوتووە".[1]

---

١- لە وتەی (نۆیەم)ەوە وەرگیراوە.

# ئێمە لەکاتی نوێژکردندا زمانحاڵ و ڕەنگپێدەرەوەی سەرجەم بوونەوەرانین



لەنوێژدا، پەرستشی زۆر بوونەوەرمان تێدا دەدرەوشێتەوە، واتـە بـە وەسـتان و جوولـەکانی نـاو نوێـژمان، لـە جوولـە و وەسـتانی زۆر بوونەوەری تر دەچین.

با سەرەتا وەستانەکانی نوێژتان بیر بهێنینەوە:

(قیـام، بـە پێـوە وەسـتان) ، (رکـوع، چـەمینەوە)، (سـجود، کڕنووش بردن)، (قعود، دانیشتن بۆ تەحیات خوێندن).

– تەنها ئێمەین کە بە پێوە دەوەستین؟

– هـەموو ڕووەك و دار و درەختـەکان بـە بـەردەوامی بـە پێـوە ڕادەوەستن، ئەوانیش بە فەرمانی بەدی هێنەرەکەیان دەجوڵێنەوە و،



پەیڕەوی لەو یاسایانە دەکەن کە پــەروەردگار بــۆی دەستنیشـــان کردوون.

دارەکـــان و ڕووەکـــەکان بـــە بەخشینی سەوزە و میوەی خۆش پێمان ئەرکی خۆیان بەجێدەهێنن، بەردەوامیش بە پێوە کاری خۆیـان ئەنجام دەدەن، هەروەك ڕاوەستانی ئێمە لە نوێژدا...

کەواتە کاتێك ئێمە بە پێوە ڕادەوەستین لە نوێژدا دەبینە نموونە و ئامـــاژە لەســـەر ڕاوەســـتانی ڕووەکـــەکان و ڕەنگپێـــدەرەوەی پەرستشەکەیان... ئەمە یەکەم.

دووەم: کاتێك بۆ ڕکوع دەچەمینەوە.

هەر لە بزن و مەڕ و ئاژەڵەماڵییەکانەوە بیگرە، تا دەگاتە گـورگ



و ئاسـك و ئـاژەڵانی کێـوی، هـەموو ئاژەڵە چوارپێکان بـەردەوام وا دێنـە پێشچاو کە لە ڕکوعدا بن، بە تایبـەت کاتێك سـەریان بۆ زەوی دادەنـەوێنن تا شتێك لەسەر زەوییەکە بخۆن، یا ئاو بخۆنەوە.

ئاژەڵەکان لە زۆر ڕووەوە خزمەتی مرۆڤەکان دەکەن، بە زمانێکی تایبەت بە خۆشیان خودا دەناسن و بە ئێمەشی دەناسێنن.

بەم شێوەیە کاتێک مرۆڤ بۆ ڕکوع دەچەمێتەوە نموونە و ڕەنگپێدەرەوەی چەمینەوەی ئاژەڵەکانە.

سێیەمیان: سوجدە..

– کام ئاژەڵانە بەردەوام لە سوجدەدان؟

– بۆ ئەمە ڕاستەوخۆ ئاژەڵە خشۆکەکان و ماسییەکانمان دێت بە خەیاڵدا، چونکە دەبینین بۆ نموونە مار و کرم و مارمێلکە و کیسەڵ و ئەم ئاژەڵانە هەمیشە لە سوجدەدان، لە بنەڕەتدا پەروەردگار هەر بەو جۆرە دروستیکردوون.

ئەو ئەرکانەی پێیان سپێردراوە هەر بەو شێوەیە ئەنجامی دەدەن کە فەرمانیان پێکراوە، هەمیشە لە ڕێی ئەو زمانەشەوە کە فێریان کراوە و تایبەتە بە خۆیان یادی خوا دەکەن، مرۆڤیش نمایشی هەردوو ڕووەکەی ئەو ئاژەڵانە دەکات.

چوارەمیان: دانیشتن لە نوێژدا، ئەها کاتێک لە نێوان سوجدەکاندا بۆ تەحیات خوێندن قینج دادەنیشین.

ئەگەر بپرسین: کام بوونەوەرە بێ جووڵە و ئەملاولا بەردەوام لە جێی خۆی دانیشتووە؟ یەکسەر دەڵێین: "چیاکان". بەڵێ، چیاکان هەمیشە بە سەنگینی دانیشتوون، هەروەک دانیشتنی ئێمە لە نوێژدا...

ئەرك و ڕاسپاردەی زۆر بە چیاکان دراوە! ئەوەتا کۆگای ئاو و کانزا و گازە سروشتییەکانن و، ڕێکخەری هاوسەنگیی پەستانی ئاوی دەریاکانن و، شانەی پاککەرەوەی هەوان، ناوەندی ڕاگرتنی هاوسەنگی زەویشن... پەناگەی زۆر ئاژەڵ و ڕووەکن، سەرەڕای چەندین و چەندین ئەرکی تریش!

ئیتر کاتێك ئێمەش لە نوێژدا دادەنیشین نمایشی شاخەکان دەکەین و لاسایی ئەوان دەکەینەوە، بەڵام بە شێوازی خۆمان پەرستشەکانی ئەوان دەکەیتەوە.

ئێمە لە نوێژەکانماندا نمایشی شێوازی پەرستشی زۆر بوونەوەری تری وەك ئەمان لە ڕێی جووڵە و وتەکانمانەوە دەکەین.

لە دارەوە تا مێروو، لە گورگەوە تا باڵندە، لە مانگاوە تا مێشوولە، لە دامێن تا لوتکەی چیاکان، گشت پەرستشی بوونەوەران لە ناو نوێژەکانمان ڕەنگدەداتەوە و، ئێمەش وەك خووی ئەوان خوای گەورە دەپەرستین، لەگەڵ هەموو بوونەوەراندا بەیەکەوە لەیەك ڕیزدا ڕادەوەستین و، دەبینە خوشك و براو هاوڕێی یەکتر.[1]

---

١- لە وتەی (نۆیەوەم)ە وەرگیراوە.



# له ناشیرینیشدا جوانی هەیە؟!

"لە هەموو شتێکدا، تەنانەت لەو شتانەشدا کە زۆر ناشیرین دەردەکەون، جوانییەکی سەرنجڕاکێش بەدیدەکرێت".

کەش و هەوایەکی ناسان، باوبۆران، ڕۆژێکی سارد و قوڕاوی، شەوێکی تاریك و بە سەرماوسۆڵە.. ئەم کەشانەمان هیچ لا خۆش نییە. باشە بۆچی؟

- چونکە ناشیرینن.

- بۆچی ناشیرینن؟

- چونکە بە هۆیانەوە سەرمامان دەبێت.

- دەی گەر وابێت، بەهاریش ناشیرینە؟

- بۆچی؟ بەهار بۆ ناشیرینە؟

- چونکە سەوزایی بەهار لە ئەنجامی بەفر و بارانی زستانەوەیە....

- چۆن؟

– گەر زستان نەبێت، بەهاریش بە دوایدا نایەت و، گەر بەفر و بارانی زۆر نەبارێت، ڕووەکەکان تێرئاو نابن و گەڵاکانیان سەوز و گەش نابن، یاخود ڕەنگە هەر زۆربەی ڕووەکەکانیش لە تینوویەتیدا سەر دەرنەکەن و، گوڵەکان نەپشکون، کەواتە بەهار لە پشت پەردەی زستانەوە خۆی حەشارداوە، لە ناوی کلوی بەفرەکانیشدا هاوینێکی گەرم و بەچێژ خۆی کشومات کردووە...

ئەها لەبەر ئەوەی لە بیاباندا بەفر و باران نابارێت و، دوانزە مانگەی ساڵ دەنکە تەرزەیەکی لێ نابینیت، نەسەرما و نە قوڕیش تێیدا نابینرێت، هەر بۆیە لە بیاباندا بەهار نییە و، نە سەوزاییەك دەبینیت و، نە بە دار و درەختی بە ڕەنگ و بەری جۆراوجۆر و بەتام خۆی دەڕازێنێتەوە، نە گوڵێکیش بەرچاو دەکەوێت، تەنها کەشێکی زۆر گەرم و وشك و هەتاویی هەیە و، هیچ شوێنەوارێکی ژیانی ئاسایی لێ نابینرێت.

گەر بە ڕستەیەك وەسفی ئەمە بکەین، دەڵێین: (**جوانیی بەهار لەسەرماوسۆڵەی زستانەوە سەرچاوە دەگرێت**).

خۆ دەزانن پەینی ئاژەڵ چییە؟ پاشەڕۆی مەڕ و بزن و مانگایە، شتێکی پیس و قێزەونە، بەڵام بەم ڕواڵەت و ڕووکەشەکەی هەڵە لێی مەڕوانن و، زوو بڕیار لەبارەی ناشیرینییەوە مەدەن.

گـۆڕینی ناشـیرینی پـەین بـۆ جوانییـەکی دڵـڕفێن کـارێکی زۆر ئاسانە! بەرهەمهێنانی بۆنی زۆرخۆش و میسکئاسا لە پەین و گۆڕینی ڕواڵەتی ناحەزی بۆ شتێکی جوان، زۆر ساکارە!

– چۆن؟

– یەك خاکەناز پـەین بـەرەو لـەبن نـەمامێکی شـلیکدا ڕۆی بکـە، دەبینیت پاشماوەیەکی زۆر کورت شلیکی زۆر سوور و گەش و جوان و بەتامت دەست دەکەوێت.



کـــەمێکیش لـــە ژێـــر نەمامی گوڵەباخێکدا ڕۆیکـە، دوای چـەند هەفتەیـەك بـە ڕەنگی جوان و بۆنی خۆشی گـوڵ و خونچـەکانی شـنەی بەهارتان یاد دەخاتەوە.

ئەگـەر سـێوی لاسـوورەی جـوان و گـەورەتان حـەز لێیـە، ئـەوا پێویستە لەبیرتان نەچێت پەین لە دەوری قەدی دارسێوەکە ڕۆ بکەن.

ئێستەش هەر سوورن کە پەین شتێکی ناشیرین و پیسە؟

کەواتـە جـوانترین و گونجـاوترین ڕسـتە کـە لەمبارەیـەوە بیڵـێین ئەوەیە کە: **(جوانەکان بەهۆی ناشیرینەکانەوە جوانن).**

جـاری وا هەیـە لـە برسـێتیدا ئـەژنۆتان دەلـەرزێت و، توانـای ڕۆیشتنتان نامێنێت، کاتی واش هەیـە لـە تینوێتیدا خەریکـە لـەهۆش

خۆتان دەچن (دەبووریێنەوە)، چونکە لێوەکانتان وشك دەبنەوە و، ڕەنگە کار بکاتە ئەوەی خەو لە چاوانتان بتۆرێت و، چاوەکانتان وەك ئەوەی خوێی تێکرابێت ببێت بە گۆمی خوێن (سوور ببێتەوە).

کێمان حەزی لەم بارودۆخەیە؟ هیچ کەسمان ئەم ساتە وەختانەی لا جوانە؟ ئارەزووی دەکات؟

بێگومان نەخێر، چونکە ناشیرین و خراپن، مایەی ئازار و ناڕەحەتین بۆمان.

باشە ئەگەر برسیمان نەبێت، چێژ لە خواردن دەبینین؟ یا گەر تینوومان نەبێت چێژ و لەزەت لە ئاوخواردنەوە دەبینین؟ گەر خەومان نەیەت سوود لە خەوتن دەبینین؟

ئەگەر ئەم بارودۆخانە نەبوایە، کە ئێمە بەڕووکەش بەشتی ناشیرین و خراپیان دەزانین، ئێستا لە بەهاو نرخی ئەم نیعمەتانە تێدەگەیشتین؟

باشە شتێك لەوە خراپتر دەبێت گەر ئێمە هەستی برسێتی و تینویەتی و خەوتنمان لەدەست بدەین؟ یا لە کاتی نەخۆشیدا ئەم هەستانەمان لەناو بچن؟ چونکە ئەو کات لاشەمان لاواز و هیلاك و ماندوو دەبێت.

ئێستا بابیربکەینەوە، برسیەتی باشترە، یاخود نان خواردن؟

هەردووکیان باش و جوانن... کەواتە گەر ئەم بابەتەش لەڕستەیەکدا کورت بکەینەوە، دەڵێین: (**تاموچێژی ناخواردن و تێری لە ناڕەحەتی برسێتییەوە دێت**).

گەر لەو ڕاستییە تێ بگەین کە: جوانیی جوانەکان، لە ژێر پەردەی ناشیرینیی ناشیرینەکانەوە شاردراونەتەوە، ئەوا ئەو کات تێدەگەین کە خودا هەموو شتێکی بۆ جوانی بەدی هێناوە، هەندێکیان ڕاستەوخۆ جوانن و جوانییەکەیان دەبینرێت و، ئاشکرا و لەبەرچاوانن، هەندێکیشیان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆیی و لەژێر پەردەوە و بە شاراوەیی جوانن، کەواتە گرنگە کە جوانییە شاردراوەکان بدۆزینەوە و، لەخۆڕا ناشیرینەکان ڕەت نەکەینەوە.



لەمەوە فێر دەبین کە هەندێ ڕووداو لە ڕواڵەتدا زۆر ناشیرین و نامۆ و بێزارکار دێنەپێش چاومان، بەڵام گەر باش لێیان وردبینەوە جوانییەکی زۆر درەوشاوە و سەرسوڕهێنەریان تێدا بەدیدەکەین، چونکە دەبینین ڕووداوگەلێکی زۆر ڕێکوپێک و سوودبەخشن، بەڵام بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ.[1]

---

١- لە وتەی (هەژدەیەم)ەوە وەرگیراوە.

# ئیمان نوورێکە مرۆڤ پرشنگدار و نوورانی دەکات



لە ڕووداوێکی خەیاڵیدا دوو شاخی بەرزم بینی، لەبەرامبەر یەکتر بوون، پردێکی زۆر سەیریش هەردووکیانی پێکەوە بەستبووەوە، لەژێر پردەکەشەوە دۆڵێکی زۆر قووڵ هەبوو.. لەناکاو خۆمم لەسەر پردەکە بینیەوە، بەڕاستی تاریکاییەکی زۆر سامناک بوو!

تەماشای لای ڕاستم کرد، گۆڕستانێکم لە تاریکاییەکەدا بەدی کرد، تەماشای لای چەپم کرد، وامزانی لە گەردەلوول و ئازار و ناڵەیەکی زۆر دەڕوانم لەو تاریکستانەدا، ژێر پردەکەشم بە کەندەڵانێکی قووڵی ترسێنەر هاتە پێش چاو.

لەو تاریکییەدا تەنها لایتێکی دەستیی بچووکم پێ بوو، بۆیە دامگیرساند و، بەو ڕووناکییە کزەی لە دەوروبەرم ڕووانی.. بەڵام چی ببینم! لەبەردەمم و لە چواردەورم جانەوەر و ئەژدیها و شێری وا دەرکەوتن، کە هەزار جار خۆزگەم دەخواست ئەو لایتەشم پێنەبوایە،

لانی کەم ئەم شتانەم نەدەدی. لایتەکەم ڕوودەکردە هەر جێیەك ترسێکی زیاتر دایدەگرتم و دەموت: "خوایە گیان، ئەم لایتە ماڵوێرانی کردم!".

لەو کاتەدا زۆر تووڕەبووم و لایتەکەم دا بەزەویدا و شکاندم، کەچی وەك ئەوەی بە شکاندنی ئەو لایتە پلاکی گڵۆپێکی زەبەلاحم داگیرساندبێت لە چرکە ساتێکدا تاریکیی لەو ناوە بڕی و، هەموو لایەك ڕووناك بووەوە و، هەموو شتێکم بە ڕوونی بینی.

تەماشام کرد ئەو پردە ڕێگایەکی زۆر ڕێکوپێکە لە دەشتێکی فراواندا و، لەلای ڕاستیشمەوە ئەو گۆڕستانە گەورەیەی کە بینیبووم باخچەیەکی زۆر جوان و ڕازاوە بوو، کە مرۆڤی نوورانی و میهرەبان کۆڕی یادکردنەوە و دەرس و پەرستشیان تێیدا بەستبوو، ئەو گەردەلوول و ناڕەحەتیانەش کە لە لای چەپمەوە دیتم، کۆمەڵێك جێی زۆر خۆش بوو کە بۆ گەشت و سەردان ئامادەکرابوون لە دامێنی چیاکانەوە.

ئەو شتانەش کە بە شێر و ئەژدیها و دڕندەم زانین، وشتر و مەڕ و بزن و ئاژەڵی ماڵی بوون، ئیتر سوپاسی خوام کرد بۆ ڕۆشنایی و نووری ئیمان.

پاشان ئەم ئایەتەم خوێندەوە و هاتمەوە سەرخۆم: ﴿اللهُ وَلِيّ الذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُم مِنَ الظُلُمَتِ إلى النُورِ﴾ البقرة:٢٥٧، واتە: (ئەوانەی ئیمانیان هێناوە بە خودا و پێغەمبەری خودا و دوایان کەوتوون، خودا

سەردار و کارهەڵسووڕێنیانە، لە تاریکیی خامی و نەفامی، تاریکیی چاوکوێری و نەزانی و، لە تاریکیی کوفر و ئارەزووپەرستی ڕزگاریان ئەکات و ئەیانخاتە ڕووناکیی فام و شعوور و زانیاری و خوداپەرستی).

لە ڕاستیدا ئەو دووشاخە سەرەتا و کۆتایی ژیانن، (واتە دنیا و دوارۆژ)، ئەو پردەش ڕێڕەوی ژیانە...

لای چەپ ڕابردووە و لای ڕاستیش داهاتووە، لایتە دەستییەکەش، خۆبەگەورەزانین و لوتبەرزیی کەسانێکە کە گوێ لە قورئان ناگرن و خۆپەرستن.

ئەو ئاژەڵ و دڕندانەش بوونەوەرانی نێو دنیا و ڕووداوەکانیەتی، ئیتر هەر یەک لەو کەسانەی کە متمانەیان تەنها بە زانیاریی خۆیان بووە و، لە ناو تاریکایی بێ ئاگایی و بێ باوەڕیدا سەرگەردان بووە، وەک من هەموو لایەکی لێ دەبێتە بەڵا و گەردەلوول و جانەوەر.

بە زانستێکی کرچ و کاڵ و پڕ لە بێ باوەڕی وەک لایتە بچووک و کزەکە ڕابردوویان بە گۆڕستان و تاریکی دێتە پێش چاو و، داهاتووش بە شێوەی ڕێکەوت دەبینن، هەموو ئەو ڕووداو و بوونەوەرانەش کە بە فەرمانی خودا دەڕۆن بەڕێوە لە بەرچاوی دەبن بە زیانبەخش و ناڕەحەتیی.

ئەم کەسانە دەچنە قاڵبی ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە تێیدا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّهُم اتَّخَذُوا الشَّيْطَانَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ اللهِ يَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُهْتَدُونَ﴾ الأعراف:٣٠، واتە: (گومڕاکان شەیتانەکانیان کردنە دۆستی

خۆیان نەك خودای پەروەردگاری جیهان، وایش ئەزانن خۆیان شارەزا و هیدایەت دراون).

بەڵام گەر ڕێی هیدایەتی خوای گەورە بدۆزنەوە و، لوتبەرزیی لەخۆیاندا نەهێڵن و، ملکەچی فەرمانەکانی خودابن، ئەوسا ئەوانیش وەك من دنیا بە ڕوونی و ڕۆشنی دەبینن و، ڕێی ڕاستی ژیانیان دەدۆزنەوە.



ئەو کاتیش هەموو گەردوون بە نووری خودا ڕووناك دەبێتەوە و پرشنگدار دەبێت، چونکە خوای گەورە نووری ئاسمانەکان و زەوییە.

پاش ئەوەش ڕابردوو بە گۆڕستان نازانن و، دڵنیان هەر سەردەمە و پێغەمبەرێکی هەبووە کە بەندەی چاکەخواز بووە و ئەرکەکانی بە باشترین و ڕاستگۆیانەترین شێوە بە ئەنجام گەیاندووە و، ژیانی خۆی لە ناو کەشێکی ڕۆحانیدا گوزەراندووە و، بە ناوی خوداوە بەرەو مەنزڵگەی خۆی بەڕێکەوتووە، بێگومان مرۆڤی باوەڕدار ئەم شتانە بەچاوی دڵی دەبینێت و هەستیان پێ دەکات.

واته گەردەلوول و باوبۆران و بوومەلەرزە و بەلا و موسیبەتەکان بە فەرمانی پڕحیکمەتی خودایی دەبینێت، چونکە دڵنیایە لە پشت ئەم موسیبەتانەوە خۆشبەختی و ئارامییەکی زۆر هەیە و، هەرچەندە ڕووداوگەلێکی وەك سەرماوسۆڵە و باوبۆران لە ڕواڵەتدا توندن و لەبەردڵان نین، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوانە کۆتاییەکی زۆر شیرین بەدوای خۆیاندا دەهێنن..

تەنانەت ئەو کەسە مردن بە خاڵی دەستپێکی ژیانێکی نوێ دەزانێت و، گۆڕیش بە دەروازەی جیهانێکی نوێ و پڕ خۆشبەختی و ئارامی.

بەڵێ، ئیمان هەروەك چۆن نوورێکە و دەروونی مرۆڤ ڕووناك دەکاتەوە و، پەیامەکانی خودای پێ دەخوێنێتەوە و پێی جێبەجێدەکات، بەو جۆرەش گەردوون ڕووناك دەکاتەوە و ڕابردوو و داهاتووش لە تاریکستانی نەزانی و سەرلێشێواویی دەپارێزێت.[1]

---

١- لە وتەی (بیست و سێیەم)ەوە وەرگیراوە.



## تەوەککول (یا پشت بەخوا بەستن)، واتای چیە؟ ئەی چۆن دەبێت؟

ئیمان هەم نوورە و، هەم هێزێکیشە، هەرکەسێك بە پلەی ئیمانی ڕاستەقینە بگات، دەتوانێت بەرامبەر گەردوون سنگ دەرپەڕێنێت و، بەپێی هێزی ئیمانەکەی خۆی لە ناڕەحەتیی ڕووداوەکان ڕزگار بکات و بڵێت: "پشتم بە خودا بەستووە".

- کەواتە تەوەککول چیە؟ چۆن دەبێت؟

**کورتە چیرۆکێك:**

سەردەمانێك دوو پیاو دەچن بۆ گەشت و، یەکی بارێك بە کۆڵیاندا دەدەن، پاشان هەر یەکەیان بلیتێك دەبڕێت و، بەیەکەوە سوار کەشتییەکی گەورە دەبن.

یەکێکیان لەگەڵ چووە سەر کەشتییەکە کۆڵ و بارەکەی دادەنێت و، لەسەری دادەنیشێت، بەڵام ئەوی دیکەیان لەبەر نەفامی و چاوچنۆکی خۆی کۆڵەپشتەکەی دانانێت.

خەڵکی ناو کەشتییەکە پێی دەڵێن: "ئەو کۆڵ و بارە قورسەت دانێ و، بۆ خۆت پشوویەك بدە".

بەڵام کابرا گوێ بەوان نادات و، دەڵێت: "نەخێر، داینانێم، ڕەنگە ون بێت، یا بیبەن.. من بەهێزم، ئەتوانم هەڵیگرم و بیپارێزم".

دووبارە پێیان وت:

"خەمت نەبێ، ئەمە کەشتیی پادشایە و، زۆر بەهێزە، خۆمان و کۆڵ و بارەکانمان ئەپارێزێت، تۆش ڕەنگە سەرت گێژ بخوات، ئەو کات خۆت و بارەکەت بکەونە دەریاکەوە، یا هێزت پێ نەمێنێت و جەستەت بەرگە نەگرێت، گەر کەشتییەوانیش بتبینێت یان دەڵێت ئەم کابرایە شێتە و لە کەشتییەکەوە فڕێت دەداتە خوار، یان دەڵێت متمانەی بە ئێمە نییە و گومانی لە کەشتییەکەمان هەیە، بۆیە فەرمانی دەستگیرکردنت دەدات.

لە هەردوو بارەکەشدا دەبیتە مایەی گاڵتەجاڕیی و، هەموان تەماشات دەکەن و، کەسیان چارەیان ناوێیت و، بە لوتبەرز دەتبینن و، ڕێزت بۆ دانانێن".

ئیدی لەمەوە کابرا هۆشی هاتەوە جێی خۆیی و، کۆڵ و بارەکەی دانا و لەسەری دانیشت، لەو کاتەدا وتی: ئۆخەی! خوا لێتان ڕازیبێت، لەم ماندوویەتی و گاڵتەجاڕییە ڕزگارم بوو.

جیاوازی حاڵی کەسێك کە پشت بەخوا ببەستێت و، یەکێکیش کە پشت لە پەیامی خوا بکات بەم جۆرەیە...

ئەی بارودۆخی ئێمە چۆنە؟

ئێمەش لە گەرمەی کێشەکان و نەخۆشییەکان و بەڵا و ناڕەحەتی دەریائاسا داین و، سوار کەشتیی ژیان بووین و بەڕێکەوتووین، تا ڕۆژەکانی تەمەنمان درێژەی هەبێت، کەشتیی ژیانمان ناگاتەجێ و لەنگەر ناگرێت.

کاتی وا هەیە ڕەوشی ژیانمان ماندووکار و بەرگەنەگیراو دەبێت، چونکە شەو و ڕۆژ کاردەکەین و، هەوڵدەدەین و، تێدەکۆشین، بەڵام بە ئامانجی خۆمان ناگەین.

دەردێکمان چارە دەبێت، یەکێکی ترمان بۆ دێت، ناڕەحەتییەکمان سووک دەبێت، کەچی زۆری پێناچێت کۆڵێکی دیکە دەدرێت بە شانماندا.

ڕۆژێك دێتە پێشەوە هەر تەڵەفۆنێك بکەین، بەسەرماندا دادەخرێتەوە لە هەر دەرگایەك بدەین بەڕووماندا پێوە دەدرێت و، ئێمەیش ناچار دەست بەئەژنۆ و بێچارە واقمان وڕدەمێنێت و، دۆش دادەمێنین.

قوتابخانە، وانەکان، تاقیکردنەوە، کێشە مادییەکان، بارگرژیی و نەهامەتییەکان، یەك لە دوای یەك بەسەرماندا دەبارن، دەکەوینە بارودۆخێکەوە کە مایەپووچ و دەستبەتاڵ و گیرفان خاڵی دەبین و، (ئەسپێ لە گیرفانماندا سەوزەڵێ خانمیەتی).

بەڵام لەناو هەموو ئەم بێچارەیی و بێقەرارییەدا شێکمان بیرچووە و، هەستی پێ ناکەین.

– ئەوە چییە؟

– (تەوەککول)ە.. وەك پیاوەکەی سەر کەشتییەکە، بە دانانی کۆڵ و بار و قورسایی سەرشانمان وەك مرۆڤێك ئەوەی لە توانامانـدا بووە کردوومانە، واتە پێشوەخت ئەرکی خۆمان بە جێ گەیاندووە و، لە هەموو دەرگاکانمان داوە و، هەموو ڕێیەکمان گرتووەتە بەر، بێ بێزاری و بێ پرتەوبۆڵە هەوڵماندوە.

ئیتر لە دوای ئەنجامدانی هەموو ئەمانەوە تەنها یەك کار دەمێنێت بیکەین، ئەوەیش ئەوەیە کە ئەنجامەکەی بۆ خودا لێبگەڕێین و، چاوەڕێی سەرکەوتن تەنها لەو زاتەوە بکەین و، تەنها و تەنها منەتباری ئەو بین.

ئەگەر هەموو شتێك بە خواستی ئێمە کۆتایی پێهات، ئایا سوپاسگوزار دەبین؟ یاخود گەر بە پێچەوانەوەی خواستی ئێمەوە بوو، ئایا ئارام دەگرین؟ چونکە ئەوەی لەسەر ئێمەیە تەنها ئەنجامدانی ئەرکەکانی سەرشانمانە.

بەپێی تەوەکول، پێویستە سەرەتا چی ئەرکمان لەسەرە بەجێی بگەیەنین و هۆوپێناوەکانی کارەکە لەبەرچاو بگرین، بەم کارەشمان جۆرێك زیکر و یادی خوای گەورەمان کردووە، واتە بە کردار نزامان

کردووه نەك هەر سەرزارەکیی، چونکە تێکۆشان و هەوڵدانمان شێوازێکی نزا و پاڕانەوەیە.

وەك نموونەی باخەوانێك.. باخەوان چی دەکات؟ زەوییەکەی دەکێڵێت و، تۆوی پێوە دەکات و، پەینی پێدا دەکات، پاشان ئاوی دەدات، پاش ئەوە بۆ بەروبووم و بەرهەمی باخەکەی چاو لە دەرگای میهرەبانیی خوای گەورە دەبڕێت.. واتە ئەم نزا و ئەرکی سەرشانی بەئەنجام گەیاندووە، بەروبوومیش لای خوداوەیە، ئەو زاتەش گەر ویستی لەسەر بێت، ڕەنجی زایە ناکات و بەروبوومێکی یەکجار



باشی دەداتێ، بەڵام ئەگەر ویستی لێنەبێت، ئەوا کاکی باخەوان دەنکە تۆوێکی بۆ دەرناچێت و سەوز نابێت، یاخود بۆ نموونە وشکەساڵی دەبێت و هەموو دەغڵودانەکەی وشك دەبێت، یان لافاوێك دەبێت، گشت بەروبوومەکەی بۆ ڕادەماڵێت..



هەرچەندە ڕەنگە سەرەتا ئەم ئەنجامە بۆ کاکی باخەوان زۆر ناخۆش و دڵتەزێن بێت، بەڵام پاش ماوەیەك تەماشا دەکات خوای گەورە بە نیعمەتێکی زۆر لەوە باشتر قەرەبووی کردووەتەوە.

خوێندکارێك تاقیکردنەوەی وانەی (بیرکاری) هەیە، لەبەر ئەوەی زۆر باش گوێی بۆ مامۆستا گرتووە و، ماندوونەناسانە سەعیی کردووە، کاتێك دەچێتە هۆڵی تاقیکردنەوەوە، دەبینێت وەڵامی هەموو پرسیارەکان دەزانێت، بۆیە زۆر بە ژیریی و وریاییەوە وەڵامەکانی دەنووسێت، بێگومان لەمبارەشدا نمرەی تەواو وەردەگرێت.

بۆ تاقیکردنەوەی داهاتووش بەهەمان شێوە خۆی ئامادە کرد، بەڵام ئەمجارە لەبەرئەوەی بەهۆی سەرئێشەوە بێتاقەت بوو، بەشێکی پرسیارەکانی بە هەڵە وەڵام دایەوە، هەرچەندە وەڵامی ڕاستیشی دەزانی! هەر بۆیە لە تاقیکردنەوەکەدا باش نەبوو.

هەر ئەم خوێندکارە لە تاقیکردنەوەی سێیەمدا زۆر باش بوو و، نمرەی تەواوی هێنا.. بەڵام لە کۆتاییدا کاتێك كارت وەردەگرێت، دەبینێت نمرەی (بیرکاری)ی زۆر باشە و، زۆر سەری سوڕدەمێنێت! بەڵام دواتر مامۆستاکەی تێی دەگەیەنێت کە ئەم نمرەیەی بەپێی هەڵسەنگاندنی ئاستی خۆی بۆ بەرزکردووەتەوە.

ئەزانی ئەمە چۆن ڕووی دا؟

ئاخر ئەو خوێندکارە هەرچی لە تواناداا بووە کردوویەتی و، پاش ئەوە تەنها چاوەڕێی ئەنجامەکەی بووە و تەواو.

ئەمە بۆ هەموو بوارەکانی ژیانی مرۆڤ دەشێت، چونکە پێویستە ئەو ئەرکەکەی خۆی ئەنجام بدات، پاشان ئەنجامەکەی تەنها لە خودا چاوەڕێ بکات، جا ئەنجامەکەشی بەدڵ بێت یان نا پێویستە پێی ڕازی بێت، چونکە مرۆڤ ڕووداوەکانی داهاتووی نازانێت، بۆیە باشتر وایە بەو بڕیار و چارەنووسە ڕازی بێت کە خوای گەورە بۆی دیاری کردووە.[١]

---

١- لە وتەی (بیست و سێیەم)ەوە وەرگیراوە.

# هەموو نزایەك گیرادەبێت



دایكی ئەحمەد، دەستی ئەحمەدی شەش ساڵەی گرت و بردی بـۆ لای پزیشك، ئەحمەدیش لەسەر مێزەكەی پزیشكەكە وێنەی منداڵێكی جوانی لەسەر پاكەتی دەرمانێك بینی، بۆیە یەكسەر وتی:

–مامە گیان، داوایەكم هەیە !

–فەرموو گیانەكەم، چیت ئەوێت؟

– بێ زەحمەت لەو دەرمانەم بۆ ئەنووسیت؟

–بابزانم، گەر بۆت بوو، دەینووسم.

پزیشكەكەش پاش ئەوەی پشكنینی بۆ كرد، نەخۆشـییەكەی بـۆ دەركەوت و، دەستی كرد بە نووسینی دەرمانەكان بۆ ئەحمەد.

لەو كاتەدا سێ ئەگەر لەبەردەم پزیشكەكەدا هەبوو:

یەکەم: ئەو دەرمانە بۆ ئەحمەد بنووسێت کە خۆی داوای کردووە.

دووەم: ئەو دەرمانە سوودی کەمە بۆ ئەحمەد، بۆیە دەرمانێکی باشتری بۆ دەنووسێت.

سێیەم: ئەو دەرمانە بۆ نەخۆشییەکەی ئەحمەد ناشێت، بۆیە بۆی نانووسێت.

– ئێمە لە خودا دەپاڕێینەوە، داوای هەموو شتێك لەو دەکەین، چونکە هەر ئەو زاتە خاوەن و بەدیهێنەری هەموو شتێکە، کەواتە ئێمە هەمیشە لێی دەپاڕێینەوە، کەچی هەموو داواکانمان نایەنەدی، ئەمە واتای ئەوە نییە کە: (نزاکانمان گیرا نەبووە؟).

– نەخێر!

لە بابەتی پاڕانەوەدا دوو وشەی گرنگ هەیە، ئەوانیش: (گیرابوون و، وەڵامدانەوە)ن.

خوای گەورە وەڵامی گشت نزاکانمان دەداتەوە، (پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە) هەروەك چۆن منداڵەکە پرسیاری لە پزیشکەکە کرد و ئەویش بە فەرموو وەڵامی دایەوە، بەڵام مەرج نییە خوای گەورە هەموو نزاکانمان گیرا بکات، وەك چۆن منداڵەکە داوای فلانە دەرمانیی کرد و پزیشکەکەش لەبەر ئەوەی بە باشی نەزانی بۆ ئەم، بۆی نەنووسی...

کەواتە وەڵامدانەوە و گیرابوونی دوعا دوو شتی جیاوازن.

کاتێك مرۆڤ لەخودا دەپاڕێتەوە، هەست دەکات لە حزوری ئەو زاتە موبارەکەدایە کە هەمیشە لێی نزیکە و گوێی لە نزاکانیەتی و، لەم دنیایەدا تەنهای ناخات، ئەمەش تا بڵێیت دەروون و ناخی ئارام دەکاتەوە.

– باشە بۆچی هەموو دوعایەکمان لێ گیرا ناکات؟

– چونکە پەروەردگار ئێمە لە خۆمان باشتر دەناسێت.

هەروەها ئێمە هیچ دەربارەی داهاتوو نازانین، ئەوەی بەیانی چی دەبێت، یا کاتژمێرێکی دیکە، تەنانەت پێشهاتەکانی چرکەیەکی دیکەش لە ئێمە شاراوەن، لەکاتێکدا هەموو ئەمانە لای خودا ئاشکرا و ڕوونن.



لەبەر ئەمەیە خودا تەنها ئەوەمان پێ دەبەخشێت کە سوودمان پێ دەگەیەنێت و زیانی لێ ناکەین، واتە گەر داوای شتێك بکەین بە کەڵك بێت بۆمان، خودا پێمان دەبەخشێت، یاخود ڕەنگە شتێکی باشتر لە داواکارییەکەی ئێمە هەبێت، خودا ئەوەیانمان پێ ببەخشێت، بەڵام ئەگەر داواکەمان زەرەر و زیانمان پێ بگەیەنێت، هەرگیز پێمان نابەخشێت.

لەبەر ئەمە دەبێت ڕازی بین بەوەی خودا پێمان دەبەخشێت و، سوپاسگوزاربین و، ناڕەزایی دەرنەبڕین.

ئێمە مافی ئەوەمان نییە، کە ئەگەر خودا شتێکی پێ نەبەخشین، هەڵسوکەوتی نابەجێ بنوێنن و، دەست بکەین بە گریان و شیوەن و ناڕەزایی دەربڕین.

قورئانی پیرۆز نموونەیەکی جوان بۆ ئەم باسە دەخاتە ڕوو:

خێزانێك لە خوای گەورە دەپاڕێنەوە کوڕێکیان پێ ببەخشێت، خوای گەورەش کچێکی وەك حەزرەتی (مریەم)یان پێدەبەخشێت.. لێرەدا نالێین نزاکەیان گیرانەبوو، بەڵکو دەڵێین: "نزاکەیان بەشێوەیەکی باشتر لە خواستی خۆیان گیرا بوو".

ڕەنگە بیستبێتتان، دایکی حەزرەتی (مریەم) لە خوای گەورە پاڕایەوە کوڕێکی پێ ببەخشێت، بۆ ئەوەی بیکاتە خزمەتکار و کارگوزاری مزگەوت لای حەزرەتی زەکەریا (سەلامی خوای لێ بێت).

ئەوەبوو منداڵی بوو، بەڵام کچێك نەك کوڕ، کەچی هەر ئەم کچە بووە دایکی پێغەمبەرێکی مەزنی وەك حەزرەتی عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) و، تاکە خانمیشە کە لە قورئانی پیرۆزدا ناوی هاتووە.

هەندێ جار مرۆڤ بۆ پێویستییەکی دنیای دەپاڕێتەوە، بەڵام خودا پاڕانەوەکەی بە دەستەبەرکردنی پێویستییەکی دواڕۆژی گیرا دەکات.

خۆ ناتوانین بڵێین خودا ئەم نزایەی ڕەتکردووەتەوە و گیرای نەکردووە.

- ئەی بڵێین چی؟

- دەڵێین بەشێوەیەکی زۆر باشتر گیرای کرد، چونکە نیعمەتەکانی دنیا کاتین، نیعمەتەکانی دوارۆژ نەبڕاوەن...



# لەبەرچی دوعا و نزا دەکەین؟

نزاکردنیش وەك نوێژکردن و ڕۆژووگرتن پەرستشە.

باشە ئێمە هۆکاری نوێژکردنمان ئەوەیە کە کارەکانمان ڕێکوپێك بێت و، ئاسان بێت بەدەستەوە؟ یان بۆ ئەوە ڕۆژوو دەگرین، تا تەندروستیمان باش بێت؟

- بێگومان نەخێر!
- دەی ئەم پەرستشانە بۆچی دەکەین؟
- سەرەتا لەبەر ئەوەی خودا فەرمانی پێکردووین.
- باشە ئەنجامی خواپەرستییمان چیە؟
- بەدەستهێنانی ڕەزامەندی و خۆشەویستی پەروەردگار.

بە واتایەکی دیکە، واتە هیچ کام لە پەرستشەکان بۆ بەدەستهێنانی سوودێکی ماددی یان شتێکی لەو جۆرە ناکرێت، چونکە مەیدانی وەرگرتنەوەی پاداشتی ئەم پەرستشانە دوارۆژە.

بەڵام خۆ بێ هۆ و بێ داخوازیش دوعا و نزا ناکەین.. کەواتە ئەو شتانەی ئێمە لە نزا و پاڕانەوەکانماندا داوایان دەکەین هۆکارێکن بۆ

نزیکبوونەوەمان لە خوای گەورە و، هەست کردنەوەمان بە بەندەبوون.

بۆ نموونە وشکەساڵییەك دەبێت و، ماوەیەك باران ناباریێت، ئیتر لەم کاتەدا بۆ پاڕانەوە بۆ بارانبارین لە جەنجاڵیی شار دەردەچین و، لە شوێنێکی فراواندا بە کۆمەڵ نزا دەکەین.

- ئەم نزایە بۆچی دەکرێت؟
- پێدەچێت بۆ بارینی باران نەبێت...
- ئەی بۆچی دەکرێت؟
- چونکە لەکاتی نزاکەدا وشکەساڵی و بێ بارانی ڕووی داوە، لەبەر ئەوە ئەو ڕووداوانە دەکرێنە هۆکارێك بۆ نزاکردنمان.

خۆ ئەگەر ئەم کارە تەنها بۆ بارانبارین بێت، ئەوا لە قاڵبی پەرستش دەچێتە دەرەوە و، بۆنی ئامانجی دنیایی لێ دێت، زۆرجاریش گیرا نابێت، چونکە نییەت و ئامانجە پاکەکەی تێدا ڕەچاو نەکراوە.

ئەگەر خوای گەورە باران ببارێنێت، واتە نزاکە گیرابووە، کەواتە کاتی نزاکردنەکەش تەواو بووە و، ئیتر پێویست بە نزاکردن نەماوە.



بەڵام ئەگەر سەرەڕای نزاکردنەکەمان باران نەباری، کەواتە هێشتا کاتی نزا کۆتایی نەهاتووە و، پێویستە لەسەر نزاکە بەردەوام بین.

- کاتێك خۆر یان مانگ دەگیرێت، نوێژی (خسوف) یا(کسوف) دەکرێت.. باشە بۆ تەواوبوونی خۆرگیران یا مانگ گیرانەکە ئەو نوێژە دەکرێت؟

- نەخێر.

چونکە کاتی دەستپێکردنی خۆرگیران یا مانگیران و تەواوبوونی دیاریکراوە، ئەستێرەناسەکان چەندین ساڵ لەمەوپێش ئەم زانیارییانەیان لابووە و لە ڕۆژمێریشدا تۆماریان کردووە.

کەواتە کاتی گیرانی ڕۆژ و مانگ، کاتی ئەنجامدانی ئەم نوێژانەیە، کاتێك کە ڕۆژ و مانگ کرانەوە ئیتر ئەم نوێژانە ناکرێت، چونکە مەبەستەکە بەجێی خۆی گەیشتووە.

دیسانەوە ئەو بەڵا و ئازار و نەخۆشییانەش کە بەسەرماندا دێت کاتی چەند نزایەکی دیاریکراوە.

- لەو کاتانەدا مرۆڤ چی دەکات؟

- بێ دەسەڵاتی و لاوازی و بێ توانایی و بێ چارەیی خۆی دەخاتەڕوو بۆ خوای گەورە و، داوای شیفا و ڕزگاربوونیش تەنها لە زاتی بەدەستەڵات و کلیل بەدەستی هەموو دەرگا داخراوەکان دەکات و ڕوو لەو دەکات و، پشت بەو زاتە دەبەستێت.

ڕاستییەکەی مەبەستی سەرەکی ئەوەیە، کە بە هۆی ئەم بارودۆخانەوە ڕوو لە خودا بکەین.

- ئەی ئەگەر سەرەڕای نزاکردنیش نەخۆشی و بەڵا و ئازار هەر بەردەوام بوو، دەبێت چی بکەین؟

- ئێمە لە نزاکانمان بەردەوام دەبین تا بەڵا و ناڕەحەتییەکانمان کۆتایی دێن.

لە ئەنجامدا:

ئێمە تەنها داوا لە خوای گەورە دەکەین و، لێی دەپاڕێینەوە، ئەنجامیش هەر بۆ ئەو لێدەگەڕێین و جێ دەهێڵین، متمانەمان بە دەستەڵات و توانا و دانایی هەیە و پشتی پێدەبەستین، چونکە ئەو زاتە موبارەکە ئێمە لە خۆمان باشتر دەناسێت و، لەخۆشمان زیاتر خۆشی دەوێین.. لە ڕاستیدا ئا ئەمەش پێویستیی بەندایەتییە.

جوانترین و قووڵترین و پڕچێژترین ئەنجامی نزاش ئەمەیە:

کەسی نزاکەر دەزانێت زاتێك هەیە دەنگی دەبیستێت، چارەی گرفت یا نەخۆشی و ئازارەکەی دەکات، میهرەبانە بۆی، هەر ئەو زاتەیە کە دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێت، بۆیە ئەم نزاکەرە دڵنیایە لەوەی کە لە چۆڵترین بیابانی دنیاشدا ئەو بە تەنیا جێی ناهێڵێت و، هەمیشە چاودێریی دەکات و، یارمەتی دەدات و سۆز و بەزەیی لەگەڵدا دەنوێنێت و، دەتوانێت پێداویستییە بێسنوورەکانی ئەم و سەرجەم بوونەوەرانی تریش دابین بکات... گومانی نییە کە ئەو زاتە دەتوانێت دوژمنە لە ژمارە نەهاتووەکانی لێ بەدوور بگرێت.

ئەم بەندەیە کاتێك لە حزووری بوونی زاتێکی ئاوادا بیر لە خۆی دەکاتەوە، هەست بە ئارامی و ئاسوودەیی دەکات، بارێکی هێندەی دنیا قورس لەسەر شانی فڕێدەدات و، سوپاسی ئەو زاتە دەکات.[١]

---

١- لە وتەی (بیست و سێیەم)ەوە وەرگیراوە.

## داواكارييەكانمان هەر لە گوڵێكەوە تا بەهەشت..



مـرۆڤ هـەروەك چـۆن داوای گوڵێـك دەكـات، ئـاواش داوای بـەهار دەكـات، هەرچـۆن ئـارەزووی باخچـەیەك دەكـات، بـەو جـۆرەش ئارەزووی بەهەشت دەكات.

هەموو دنیا مرۆڤ تێر ناكات، وانییە؟

هەرچەنێكمان بدرێتێ، هێشتا دەڵێین: "هیچی تر ماوە؟".

ببینـە خـاوەنی هـەر شـتێك، هێشـتا داوای زیـاتر دەكـەین، هەرچییەكمان هەبێت هێشتا تامەزرۆی زیاترین.

هەرچۆن پێغەمبەرمان ﷺ فەرموویەتی: "ئەگەر یەك دۆڵی پڕ لـە ئاڵتون بە مرۆڤ بدرێت، داوای دوو دۆڵ لە ئاڵتون دەكات، مەگەر تەنها خاك و خۆڵی ناو گۆڕ چاوی مرۆڤ پڕ بكاتەوە و، تێری بكات".

گەر بڵێین: "لایەكی ئەم شارەت پێدەدەین" ڕەتی ناكەیتەوە.

گەر هەموو شارەکەشت پێ بدەن، دیسان قبووڵی دەکەیت، تەنانەت گەر هەموو وڵاتەکەشت لەسەر تاپۆ بکەن، ناڵێیت: "نا".

گەر زەویشمان پێشکەش بکەن، چاو لە هەسارەکانی دیکە دەبڕین!

ئاخر مرۆڤ بە هەموو دنیاش تێر ناخوات، چونکە تەنیا دنیا بۆ مرۆڤ بەس نییە.

– بۆچی؟

– چونکە مرۆڤ ئارەزووی شتێکی نەبڕاوە و بێ کۆتا دەکات، چونکە هەستی نەبڕانەوەیی و بێ کۆتایی لە ڕۆحیدایە، چونکە شتی فانی و کاتی و لەگەڵ ژیاندا سنووردارکراو بەشی مرۆڤ ناکات.

گوڵێکمان دەوێت، بەڵام بەس نییە.. باخچەیەکمان دەوێت، دیسان ئەویش بەس نییە، ئارەزووی بەهار دەکەین، کەچی ئەویش تەواو ئاسوودەمان ناکات.. ئەوپەڕی ئاواتمان بەهەشتە، بەڵام پاش ئەوەش هەر هەست بە تێربوون ناکەین.. ئەزانن بۆ؟ چونکە لەگەڵ هەموو ئەم جوانییانەدا داوای بینینی خودی پەروەردگارمان دەکەین؟



کێش ئەم داواکارییانەمان بۆ دێنێتە دی؟ بێگومان هەر پەروەردگاری میهرەبان.

گەر خۆشەویستێکمان لە دەرەوەی وڵات بێت، ئەوا بێگومان بەئاواتەوەین سەردانی بکەین، جا ئەگەر دایکمان یا باوکمان یاخود منداڵەکان و خێزانمان لەوێ بن، ئەوا هەردەم بیروهۆشمان لایانە و، دەمانەوێت هەرچی زووترە بچینە ئەوێ، بۆ ئەوەی ئەم سەفەرەش ڕێکبخەین، خۆمان ئامادە دەکەین و هەرچۆنێك بێت ڕێگەیەك دەدۆزینەوە بۆ ئەو سەردانە.

ئەی ئەگەر بزانین جێیەك هەیە کە لەسەدا نەوەد و نۆ (٩٩٪)ی خۆشەویستانمانی لێیە، دەبێ چەند ئارەزوو بکەین بچین؟

ئەی بۆ جیهانی پاش گۆڕ چەندێك تامەزرۆ دەبین، کە سەرەتا سەد و بیست و چوار (١٢٤) هەزار پێغەمبەر و، هەزارەها هاوەڵ و، میلۆنەها خواناسی مەزنی ئیسلام و، ملیارەها بڕوادار و، پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ کۆچیان بۆی کردووە؟

کێ ئێمە بەم خۆشەویستانەمان دەگەیەنێت؟

کێ ئێمە لەگەڵ ئەم مرۆڤانەدا کۆدەکاتەوە؟

کێ ئێمە دەگەیەنێتە جیهانی ئاخیرەت؟



بەڵێ، هێزێکی وامان پێویستە کە دەرگای دنیا دابخات و، دەرگای دوا ڕۆژ بکاتەوە، دنیا هەڵبگرێت و دوا ڕۆژ لەجێی دابنێت، چونکە جگە لە هێزێکی لەم شێوەیە کەسی دیکە ئەم کارەی پێناکرێت.

جگە لە هێزێکی هاوشێوە، هیچ کەسی دیکە ناتوانێت داواکارییەکانمان دابین بکات.

جگە لە هێزێکی لەم شێوەیە، هیچ کەس ناتوانێت ئێمە بە خۆشەویستەکانمان بگەیەنێت.

ئەوەی دنیای دروستکردووە، هەر ئەویش دەتوانێت کۆتایی پێ بهێنێت و، ئاسەواریشی نەهێڵێت و، ئەوەی قیامەت بەرپا دەکات، دواڕۆژیشی بەدەستە، چونکە ئارەزووە بێکۆتاکانی ئێمە تەنها هێزێکی بێ سەرەتا و کۆتا و بێ سنوور دەتوانێت بۆمان دەستەبەر بکات، کەواتە ئێمە خودا و پەروەردگار و بەدیهێنەرێکی ئاوامان هەیە، کە خاوەنی هەموو شتێکە و، کردنەوەی هەموو دەرگایەکیش بەدەستی قودرەت و زانستی زاتی موبارەکییەتی.

گەنجینەی هەموو شتێك لای ئەوە، هەموو شتێك لە ژێر چاودێری ئەودایە، هیچ خاڵێکی لاوازیی و بێتوانایی و بێدەسەڵاتیی لەو زاتەدا بوونی نییە.

بەڕای ئێوە، نابێت بەندایەتی خودایەکی ئاوا بکرێت؟

نابێت هەوڵی خۆنزیککردنەوە و خۆشویستنی خودایەکی وا بدەین؟

پێویست نییە کە لەبەردەم خودایەکی وادا بچەمینەوە؟

پێویست نییە کە سوجدە بۆ خودایەکی وابەرین؟

پێویست نییە کە پێغەمبەرێکمان خۆشبوێت، کە خودا خۆشی دەوێت و فەرمانیشی بە خۆشویستنی کردووە؟

پێویستە بۆ نزیکبوونەوە و گەیشتن بە پەروەردگارێکی ئاوا چی بکەین؟[1]

---

١- لە وتەی (بیست وسێیەم)ەوە وەرگیراوە.



## زۆر بەهێزین و،
## زۆر لاوازیشین!

مرۆڤ لەم گەردوونەدا لە منداڵێکی زۆر ناسك و نازدار دەچێت، کە لە کاتی بێ هێزیی و بێ تواناییدا هێز و دەستەڵاتێك پشتیوانیی دەکات.

مرۆڤ تەمەنی هەرچەندێك بێت هێشتا منداڵە !

لەناخی هەمووماندا منداڵێك هەیە، بەڵام منداڵێکی سێ ساڵان نا کە عەقڵی بە هیچ ناشکێت، بەڵکو منداڵێکە کە ناتوانێت هیچ کارێکی خۆی ئەنجام بدات.

ساوایەکیش لەم تەمەنەدا پێویستی بە یارمەتی و دەستگیرۆیی و پاراستن هەیە، چونکە لاوازە و، بێتوانایە و، بەستەزمانە.

دەتوانێت بە ئاسانی پێویستییەکانی دابین بکات؟ واتە کە تینووی بوو، خۆی دەتوانێت بچێت ئاو بخواتەوە؟ نەخێر، بە کڕوزانەوەوە بە یەکێك دەڵێت: "ئاوووو!".

دایـك و بـاوكی، گـەر لـە شـیرینی خەویشـدا بـن، ڕاسـتەوخۆ هەڵدەستن و پەرداخێك ئاوی دەدەنێ، واتـە یەكسـەر پێویستییەكەی بۆ جێبەجێ دەكەن.

ئەی ئەگەر برسی بێت، چی دەكات؟

دەگری، هاواردەكات، هەر عەجولییەكی پێبكرێت درێغی ناكات.

دایكیش هەر كارێكی هەبێت، دەستی لێ هەڵدەگرێت و، ڕاستەخۆ شتێكی دەداتێ بیخوات، تا تێری بكات.

زۆرجار سەرقاڵی یاریكردن و هەڵبەزودابەز دەبێت و، جلوبـەرگ و ڕووخساری خۆی پیس دەكات، بەڵام ناتوانێت خۆی پـاك بكاتـەوە و، توانـای داكەنـدنی جلـەكانی و شـۆردنیانی نییـە، بۆیـە هـەروا بـەو حاڵەیـەوە دەسـوڕێتەوە و ناسـرەوێت، بـەڵام هـەر كـە دایكـی ئـەم سیمایەی منداڵەكەی بینـی، یەكسـەر دەكەوێتـە خـۆ و، جلـەكانی بـۆ دەگۆڕێت و دەیشوات و، بەرگی خاوێنیشی لەبەر دەكاتەوە.

جا ئەگەر بەدەم ڕاكردنەوە بكەوێت و ئەژنۆی برینداربێت و قـۆڵی خوێنی لێ بێت، بەوپەڕی پاكیی و بەستەزمانییەوە دەستدەكات بـە گریان و، دەوروبەرەكەی دەهێنێتە سەیری خۆی.

منداڵ لەم حاڵەدا چـی دەكـات؟ داوای یارمـەتی دەكـات، هـاواری دایك و باوك یا خوشك و برا و كەسە نزیكەكانی دەكات، وانییە؟

دایکیشی یەکسەر بەدەمییەوە دەچێت و لە باوەشی دەگرێت، ئیتر ماچی دەکات و، نازی دەکێشێت و، هێوری دەکاتەوە، برینەکەی بۆ خاوێن دەکاتەوە و، بۆی دەپێچێت.

منداڵێك لە هەر کوێ بەم شێوە پاك و بێ دەستەڵاتانەیە بگری، ئێمە -با ناسیاوی منداڵەکەش نەبین- هەر کە گوێمان لە دەنگی گریانی بێت، خۆمان بۆ ناگیرێت و دەچین بەهانایەوە و، هەوڵ دەدەین ژیری بکەینەوە.

منداڵ بەم لاوازی و بێ دەستەڵاتییەی خۆی هێزێکی وای هەیە، کە تەنانەت هەستی بەزەیی مرۆڤە هەرە بەهێزەکانیش دەبزوێنێت تابچن بەدەمییەوە و خزمەتی بکەن!

تەنانەت بەهۆی سروشتە پاك و شیرینەکەیەوە دەتوانێت بە جوڵەی پەنجەیەکی سەرنجی پاڵەوانان و قارەمانان بۆلای خۆی رابکێشێت، بەڵام گەر پاش ئەوەی ئەو منداڵە گەورە بوو و فامی کردەوە و، بەهێز بوو بڵێت: "من کە منداڵ بووم، بەو هێز و توانا کاڵ و کرچەمەوە دایك و باوك و کەسە نزیکەکانم بە خۆمەوە سەرقاڵ کردبوو، ئەی گەر ئێستە بگریم چی دەبێت؟".

- چی دەبێت؟

- تەنها سەرزەنشت دەکرێت و، بێدەنگ دەکرێت... دەی مرۆڤیش هەر وایە.



ئێمـــه لەبــەر بــێ دەستەڵاتی و لاوازییمان هەموو گەردوون کراوەتە ژێـــر فەرمانمانـــەوە و، هەموو بوونەوەرانمان بۆ دەستەمۆ کراوە.

خۆر لەژێر فـەرمانی ئێمــەدا وەك گڵــۆپ و سـۆپا وایــە، میـوەی خـۆش و بـەتامان بـۆ پێدەگەیەنێت.

زەوی ئامادەیـە بـۆ دابینکردنـی هــەموو پێویسـتییەکانمان، بـە دەریایــەوە و بــە وشـکانییەوە و بــە شــاخ و دۆڵ و کــەژ و کێــو و بەردییــەوە و.. هتــد، بــە کـورتی سـەراپای گـەردوون لــە خزمــەتی ئێمەدایە، مانگ بۆ خزمەتکردن بە مرۆڤایـەتی بەدیهێنراوە و مۆمێکـە کە شەوگارە تاریك و ئەنگوستە چاوەکانمان بـۆ ڕۆشـن دەکاتـەوە و، بەهۆیـەوە مانگـەکانی سـاڵ لەیـەك جیادەکەینـەوە و ڕۆژژمێـر پێـك دەهێنین.

ئـاو، هــەوا، خـاك و خـۆڵ، گشـت ماددەکـان بـۆ خزمــەتی ئێمــە کاردەکەن.

ئێستا هیچ مرۆڤێك دەتوانێت بڵێت: "من بەهێز و توانای خۆم کار بــە خــۆر دەکــەم و، زەوی دەســوڕێنمەوە و، مانگیشــی بــەدوادا ڕادەکێشم".

ئەگەر کەسێك قسـەیەکی وا نازیرانـە بڵێـت، تـا دەتـوانن گاڵتـەی پێدەکەن، وانییە؟

کەواتە، هەر بێ دەستەڵاتی و بێ توانـایی و بـێ چـارەیی ئێمەیـە کە سۆز و بەزەیی خوای پەروەردگاری بەسەرماندا ڕشتووە.

دەنا ئێمە بە زۆر و بە هێزی خۆمان ئەم دنیایەمان لە ژێـر ڕکێفـی خۆمان نەناوە، بەڵکو ئەوە لە توانای ئەو زاتەدایـە کـە ئاوریشـمی بـە کرمـی ئاوریشـم بەرهــەم هێنــاوە و، کردوویەتــە بــەرگی مـرۆڤ و، لــە مێروویەکی ژەهراویی وەك هەنگەوە هـەنگوینی نـاوازە بـۆ مـرۆڤ سـاز دەکات و، لە مەڕێکی بەستەزمانەوە شیر بۆ مرۆڤ بەرهــەم دەهێنێـت؛ واتە هەرگیز لە توانای ئەو مرۆڤەدا نییە حە بە دووپشکێکی نابینا، یـا تووڵەمارێك، یاخود مێشوولەیەکی وردیلە بەزەوییدا دەدرێت.

هەموو ئەمانەش تەنها و تەنها منەت و بەزەیی و بەخششی خوای پەروەردگارە.

– ئەی ئەرکی ئێمە چییە؟ یا پێویستە چی بکەین؟

– هێنــده بـزانین کـه گـەردوون بـۆ ئێمـه بـەدیهێنراوه و، گشـت نیعمەتـەکانیش تـەنها لـه لایـەن خـوداوەن، بۆیـه پێویسـته هەمیشـه سوپاسگوزاری ببین و بەندایەتیی بکەین.

خوای (ئەلڕەحیم)ی من، دنیای کردووه به خانوویەك بۆم، خۆر و مانگی کردووەته گڵۆپ و، بەهاری کردووەته چەپکێك گوڵ و، هـاوینی کردووەته سفرەی نیعمەتەکان و، ئاژەڵەکانی کردووەته خزمـەتکار و، ڕووەکـەکان و گوڵـەکانی کردووەتـه ئارایشـت و ڕازێنـەرەوه لـەم خانووەدا.

ئەگـەر لەگـەڵ هـەموو ئەمانەشـدا گـوێ بـۆ شـەیتان و نەفسـی بەدکارمان بگرین، ئەوا دەکەوینه نزمترین باروودۆخـەوه، بـەڵام ئەگـەر گوێڕایەڵی پـەیامی ڕاسـتی و قورئـانی پـیرۆز بـین، ئـەوا بـۆ بـەرزترین بەرزاییەکان دەڕۆین و دەبینه نموونەیەکی گەشی ئەم گەردوونه.[1]

---

١– له وتەی (بیست و سێیەم)ەوه وەرگیراوه.

# (لەخواترسان) واتای چیە؟



چۆن لەخوا بترسین؟ مەگەر خوا ترسێنەرە؟ بۆچی لە خودا بترسین؟

ترسیش هێندەی خۆشەویستی جوان و چێژبەخشە.

ترسیش هێندەی خۆشەویستی خۆشی بە مرۆڤ دەگەیەنێت.

– بەڵام ئەمە چۆن ترسێکە؟

– واتە کەسێکمان زۆر خۆش بوێت، بەڵام لەهەمان کاتدا لێی بترسین.

ئەگەر منداڵێکی یەك ساڵە ژیریی هەبووایە و لێیان بپرسیایە: "خۆشترین و شیرینترین حاڵت چییە؟"، ڕەنگە بیوتایە: "تێگەیشتن لە بێدەسەڵاتیی خۆم و، خۆهەڵدانە نێو باوەشی دایکمەوە سەرەڕای ترسان لە زللە میهرەبانانەکانیشی".

لەڕاستیدا لەخواترسانمان تۆقینێك نییە لە دڵڕەقی ئەو زاتەوە لامان دروست بووبێت، بەڵكو خۆفڕێدانە ناو میهر و بەزەیی ئەو زاتە و، پشتبەستنە بە سۆز و میهرەبانیی نەبڕاوەی.

كەواتە سۆز و بەزەیی دایكان تەنها پرشنگێكی سۆز و بەزەیی پەروەردگارە.

– مەبەستت چییە؟

– بۆ نموونە، خۆر سەرچاوەی ڕووناكییە.

ڕووناكیش، ئەو تیشكانەیە كە بەهۆیانەوە دەوروبەر و ماددەكان دەبینین و، (نوور)یشی پێ دەڵێین.

كەواتە، خۆر ڕووناكییەكەی لە ناوی پیرۆزی (ئەلنوور)ی خوداوە وەرگرتووە و، بە ڕەنگدانەوەی ناوی پیرۆزی (ئەلنوور)، دەبێتە سەرچاوەی ڕۆشنایی.

بەهەمان شێوە ناوی پیرۆزی (ئەلرەحیم)ی پەروەردگار بناغە و بنچینەی هەموو سۆز و بەزەییەكە و، ڕەنگدانەوەی ئەم ناوە پیرۆزە لە دڵی دایكاندا، هەریەكەیانی كردووتە قارەمانێكی سۆز و بەزەیی.

– باشە تەنها دایكی مرۆڤەكان بەم جۆرەن؟

– نەخێر، سۆزی دایكە ئاژەڵەكانیش لە بەخێوكردنیان بۆ بێچووەكانیاندا هەر لە ناوی پیرۆزی (ئەلرەحیم)ەوە سەرچاوەی گرتووە.

کەواتە ئەم وتەیە زۆر لە جێی خۆیدایە، کە دەڵێت: "لەخواترسان، بریتیە لە دۆزینەوەی ئەو ڕێگەیەی بە سۆز و بەزەیی خوای گەورەمان دەگەیەنێت". گەرنا، خودا نە ترسێنەرە و نە مایەی سڵ لێکردنەوەیە.

مانایەکی لە خواترسان، نیشاندانی ڕێزێکی بێهاوتایە بەرامبەر بەو زاتە..

(پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە) بۆ نموونە، ئەو کەسانەی کە بەزانست و کەسایەتی خۆیان بە پلە و پایەیەك گەیشتوون، لەبەرامبەریاندا لە ناخەوە هەست بە خۆشەویستی و ترسێك دەکەین، وانییە؟

باشە خۆ خوای گەورە بەدیهێنەر و خاوەنی گەردوونە و، هەموو شتێك ملکەچی فەرمانی زاتی موبارەکییەتی.

دنیا و دەریاکان و ئاسمانەکان و خۆرەکان و مانگەکان و ئەستێرەکان و گشت بوونەوەران لە ژێر دەستەڵات و فەرمانی زاتی موبارەکیدان.

ئێمەش وەك بەندەیەك لە ئاستیدا هەست بە ترس و لەرزێکی تێکەڵ بە خۆشەویستی دەکەین، ئەم ترسە ئێمە لەو زاتە نزیك دەکاتەوە و، ڕواڵەتێکی دیکەی خۆشەویستییەکەمانە.

هەر لە ئەنجامی گوێڕایەڵیی و پشت بەستنیشمانەوە بە سۆزی پەروەردگارمان بە بەهەشتێکی نەبڕاوەی پڕ لە جوانی و خۆشی شاد

دەبین. لەبەرامبەریشدا، ئەو کەسانەی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی نابن و تاوان دەکەن و، ستەم لە کەسانی دیکە دەکەن دەبێت بچنە دۆزەخەوە.

ئێمەش لەوە دەترسین کە بەگوێی نەفس یا شەیتان بکەین و، خۆمان دووچاری سزای خوا بکەین.

بۆ نموونە، دەوڵەت، پۆلیس، سەرباز، هێزەکانی پاراستنی ئارامی و ئاسایشمان کار دەکەن، نەك بۆ سزادان و ئازاردانی خەڵکی،



بەڵکو بۆ پاراستنی سەلامەتی و هێمنیی و ئاسایشی هاوڵاتیان، بەڵام ئێمە هەر لە دەوڵەت و پۆلیس دەترسین.

– بۆچی؟

– چونکە دەڵێین گەر تاوان بکەین سزامان دەدەن.. کاتێکیش سەرپێچیی یاسا دەکەین لە چاودێری پۆلیسەکان دەترسین، دەنا خۆ لە بنەڕەتدا دەوڵەت و پۆلیس دامودەزگای ترسێنەر نین.

هەروەها گەورەیی و بەدەستەڵاتیی دەوڵەتیش مرۆڤ ناچار دەکات ڕێز بۆ خۆی و کاربەدەستانی دابنێت.

بەڵام هەر کەس لە خودا بترسێت لە هیچ کەس و شتێکی دیکە ناترسێت، چونکە هەموو کەس و شتێك ملکەچی فەرمانی خوان و، هیچ شتێك دوور لە زانست و فەرمانی ئەو ڕوونادات.

مرۆڤ گەر بە ڕاستی لە خودا بترسێت، ئەوا بوونەوەرانی دیکە هەرچەندە گەورە و دڕندە و ترسێنەریش بن، ناتوانن زەرەر و زیانی پێ بگەیەنن.

لایەنێکی دیکەی لەخواترسانیش ئەوەیە کە:

ئەو زاتە ئێمەی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون و، نیعمەتانێکی بێ شوماری بەسەردا ڕژاندووین و، بەردەوام دەمانپارێزێت، کەواتە کاتێك هەستی خۆشەویستیمان بۆ ئەو زاتە لێ ون دەبێت و، لێی دووردەکەوینەوە و، پەیوەندییمان پێوەی لاواز دەبێت؛ ئەوا خەمبار دەبین.

هەروەها هەر ئەو زاتە لەو شتانە دەمانپارێزێت کە دەمانترسێنن و، مایەی مەترسین بۆمان.

بەم شێوەیە، ئێمەش بە پشتبەستن بەو زاتە و پەنا بۆ بردنی، هێور دەبینەوە و دڵنیا و ئاسوودە دەبین.[1]

---

١- لە وتەی (بیست و چوارەم)ەوە وەرگیراوە.



# چۆن لە قەدەر تێ بگەین؟

لە مرۆڤدا تەنها خواست و ویستی لاوەکی، واتە داواکاری سادە و، نییەت و حەزی ئەنجامدانی هەیە.

کاتێك مرۆڤ دەیەوێت کارێك بکات، نیازی ئەنجامدانی دەخاتە دڵییەوە و، لەناو چەند هەڵبژاردنێکدا یەك دانەیان هەڵدەبژێرێت، ئا لەم کاتەدا خوای گەورەش هەڵبژاردەکەی بۆ دەسازێنێت.

بۆ نموونە، ویستمان دەستمان بەرزبکەینەوە، واتە لەبری نوشتاندنەوە بەرزکردنەوەمان، هەڵبژارد، ئیتر لەو کاتەدا دەستمان بە فەرمانی خودا بەرزدەکرێتەوە.

چونکە ماسولکەکان و خوێن و مێشکمان بە تەنها قسەیەکی ئێمە ناکەونە کار و، خۆمان بەڕێوەی نابەین، بەڵکو ئەم کار و بزاوت و جوڵەی ئەنجامدان و سازاندنە لە دەستی خوای گەورەدایە.

گەر دەستمان بەرزکردەوە و، زللەیەکمان دا لە ڕوومەتی بەرامبەرەکەمان، پاشان دەستمان دانەواندەوە.

– ئێستە کێ ویستی لە زللەوەشاندن بوو؟

- ئێمەی مرۆڤ.
- ئەی کێ بنەمای زڵلەپیاکێشانی داناوە ؟
- پەروەردگار.
- کەواتە لێرەدا کێ بەرپرسیارە ؟
- ئێمەی مرۆڤ.

ئەمجارە دەستمان بەرزکردەوە و بەنەرمی دەستمان بە ڕوومەتی هاوڕێکەماندا هێنا و خۆشەویستی خۆمانمان بۆ دەربڕی.

- لەمبارەدا، کێ ویستی لەسەر خۆشەویستی دەربڕینمان بوو بۆ هاوڕێکەمان؟
- ئێمەی مرۆڤ.
- ئەی کێ بنەمای خۆشەویستی دەربڕینی بەدیهێناوە ؟
- خوای گەورە.
- لێرەدا کێ بەرپرسیار بوو؟
- هەر ئێمەی مرۆڤ.

کەواتە، ئێمە هەر کارێکمان بوێت و، هەر شتێك هەڵبژێرین، ئەوا خوا ئەوە دروست دەکات، بەڵام ئێمە بەرپرسیار دەبین لەو کارە، چونکە خاوەنی هەڵبژاردەکە بووین.

بەم هێنانەکایەیەی خواست و نییەت و کار و هەڵبژاردنانەی ئێمە لەلایەن پەروەردگارمانەوە دەوترێت (قەدەر)ی خودا.

خودا زمانمانی دروستکردووه و، توانای قسەکردنیشی پێ داوه،
بەڵام گەر ئێمە بڕیاری وتنی وشەی ناشیرین و ناپەسەند بدەین، ئەوا
خوداش ئەو وشانە دەسازێنێت و بە فەرمانی خۆی لە زارمان
دەردەپەڕێنێت.

خۆ ئەگەر وتنی وشەی شیرین و جوان و پەسەند هەڵبژێرین، ئەوا
پەروەردگار ئەو وتە جوانانە دروست دەکات و، بە فەرمانی خۆی لە
زمانمانەوە دەردەچن.

کاتێك قسەی باش یا نابـاش دەکەین ئەوا خۆمـان بەرپرسیارین
لێی، بەڵام گەر وشەی جوان و زمانی شیرین هەڵبـژێرین، ئەوا خۆمان
لای هەمووان خۆشەویست دەکەین.

– قەدەر چییە؟

– دروستکردنی زمان و، زمانزانیی و ئەو قسانەی کە دەیانکەین
لە لایەن خوداوەیە، بەڵام خۆمان لەسەر باشیی و خراپییەکەی بڕیار
دەدەین و، بەرپرسیار دەبین لە بەکارهێنانی زمانماندا لە وشە و
قسەی باش یا خراپدا.

## مرۆڤ بۆ خۆی بەرپرسیارە

نموونەیەکی جوان بۆ ئەم بابەتە:

گەر باوکت خوشکە سێ ساڵانەکەت لەسەر شان بنێت و بیبەوێت بیگێڕیت، خۆیشی سەربەست و سەرپشك بکات لەسەر ئەوەی بۆ هەر کوێیەك بڵێت بیبات.

خوشکەکەشت ویستی بچێتە سەر ئەو گردەی بەرامبەر ماڵەکەتانە، بۆیە باوکیشت بردی بۆ ئەوێ، بەڵام پاش کەمێك خوشکەکەت سەرمای بوو و، تای لێ هات و، دەستی کرد بە گریان و شیوەن و، بە باوکتی وت: "تۆ منت هێنا بۆ ئێرە، ئەوەتا سەرمام بوو، تۆ تووشی ئەم نەخۆشییەت کردم".

ئەویش بە خوشکەکەت دەڵێت: "تۆ خۆت ویستت، من تەنها بەگوێی خۆتم کرد و، هێنامیت"، بەمجۆرە بەرپرسیارییەتی نەخۆشییەکەی لە ئەستۆی باوکت نییە.

خوای گەورە نیعمەتێکی گەورەی وەك عەقڵی بە مرۆڤ بەخشیوە، کە دەتوانێت بەهۆیەوە چاکە و خراپە و جوان و ناشیرین و، ڕاست و هەڵە و، باوەڕ و بێ باوەڕی و، بەهەشت و دۆزەخ لەیەکتری جیابکاتەوە، لەبەرامبەردا هەموو ئەم شتە دژبەیەکانەشی دروستکردووە و، مرۆڤی لە هەڵبژاردنیاندا سەرپشك و سەربەست کردووە، واتە بڕیاری کۆتایی داوەتە دەست مرۆڤ خۆی.

مرۆڤ خۆی نیەتی ئەنجامدانی کارێك دەخاتە دڵییەوە و، خوداش بۆی دەسازێنێت.

- کەواتە ئێستا ئەو مرۆڤەی کە ویستی لەکارەکە بووە و ئەنجامیداوە لێی بەرپرسیارە، یاخود ئەو خودایەی کە کارەکەی بۆ سازاندووە؟

- بێ گومان مرۆڤەکە خۆی.

- بۆچی؟

- چونکە مرۆڤ بۆ خۆی نیازی ئەنجامدانی ئەو کارەی هەبووە.



هەربۆیە ناشێت بڵێین: "ئەگەر خودا ویستی لەسەر نەبوایە من ئەو کارە خراپەم نەئەکرد و، ئەو ڕێگە هەڵەیەم هەڵنەئەبژارد".

- بۆچی ناشێت ئەمە بڵێین؟

- چونکە گەر وابێت، ئەوا دەبوو مرۆڤ عەقڵ و توانای بڕیاردانی نەبوایە، کە بێ گومان هەیەتی و، لە هەموو بوونەوەرانیش زیاتر.

دەی کەواتە مادەم عەقڵمان هەیە و، توانای هەڵبژاردنمان هەیە، کەواتە دەبێت بەکاریبهێنین و، ڕێی ڕاست و کاری باشی پێ بدۆزینەوە و، هەڵی بژێرین، تا بیکەین.

– گەر تۆ باش سەعیت نەکرد و لە وانەکەتدا چل لە سەدت وەرگرت، لە ئاکامدا ئەو ساڵە لە پۆلەکەتتدا مایتەوە! ئێستە کێ بەرپرسیارە لەم شکستەت؟ بێگومان خۆت.

– ئەی گەر خۆت باش سەعیت کرد و، نمرەی بەرزت هێنا و، خەڵاتی یەکەمییت وەرگرت.. لەمبارەدا کێ ئەم سەرکەوتنەی بەدەست هێنا؟ دیسانەوە هەر خۆت.

لەو بارەیاندا کە سەرکەوتوو بوویت خوێندنگەکەت بەو هەڵبژاردنە باشەی کە کردت، تۆیان خەڵات کرد و، ڕێزیان لە خۆت و هەڵبژاردنە دروستەکەت و ماندووبوونەکەت نا.

* * *

باوکت ئۆتۆمبێلێکی تازەی کڕی و، ئێوەیشی برد بۆ گەشت و سەیران پێی، لە ڕێگە لەناکاو باوکت لایدایە قەراغی شەقامەکە و، هەر ئەوەندەی زانی ئۆتۆمبیلەکەی دا بە بەردێکی گەورەدا.

جا ئەگەر لەو کاتەدا باوکت بێت ئەندازیاری ڕێگەکە، یاخود کارگەی دروستکەری ئۆتۆمبێلەکە، یان پۆلیسی هاتووچۆ تاوانبار بکات، ئەوا چی پێ دەڵێین؟

بێ گومان پێی پێدەکەنن، چونکە تەنها یەك تاوانبار هەیە، ئەویش باوکت بووە کە شۆفێر بووە و، لەناکاو بێ وریابوون لایداوەتە سەر قەراغی شەقامەکە.

باوکت دەتوانێت بڵێت: "جا خۆ ئەمە قەدەری من بووە" و، تاوانەکە بخاتە ئەستۆی (قەدەر)؟

یان گەر لەکاتێکدا بە ئۆتۆمێلەکەی باوکت بە شەقامێکدا بڕۆن، بەڵام لەناکاو باوکت خێراییەکەی زیادکرد و ئۆتۆمبێلەکەی بە ئۆتۆمبێلەکەی پێشەوەدا دا، دوای ماوەیەك کە پۆلیسی هاتوچۆ هات و پشکنینیان کرد، کێ تاوانبار دەردەچێت؟ بێگومان باوکت.

– بۆچی؟

– چونکە ئەو لە دواوە پیای کێشاوە.. خۆ ناتوانێت بڵێت: "ئاخر شۆفێری ئۆتۆمبێلەکەی پێشەوەم زۆر هێواش لێی دەخوڕی، ئەگەر خێراتر بووایە، پێمدا نەدەکێشا؟".

لەسەروو ئەوەشەوە بڵێت:"چی بکەین، قەدەری خوا وا بوو"، ئیتر بەمە خۆی لە هەڵە و تاوانەکەی بدزێتەوە.

* * *

نموونەیەکی دیکە:

برا گەورەکەت کە شۆفێریی دەکرد، زۆر بە خێرایی بە ئۆتۆمبێلەکەوە خۆی کرد بە ناو پێچێکدا و، ئۆتۆمبێلەکەی بۆ کۆنترۆڵ نەکرا و، کەوتە ناو شیوێکەوە، لە ئەنجامدا کەمێك ئازاری گەیشت، بەڵام هەرچۆنێك بوو ڕزگاری بوو.

دوای کـەمێك پیاوێـك هـات و پێـی وت: "مـن زانـیم کـە وات بەسـەردێت، لـە دوورەوە ئاگـام لـە ڕووداوەکـە بـوو، نـەدەبوو بـەو خێراییە بسوڕایتایەتەوە، چونکە دیار بوو کە ئاوات لێ بەسەردێت".

برا گەورەکەت دەتوانێت بـەو پیـاوە بڵێـت: "تـۆ تاوانباریـت، تـۆ دەتزانی من تووشی ئەم ڕووداوە دەبم بۆیە تووشم بـووە"؟ بێگومـان نەخێر.

کەواتە ئەو ڕاستییەیەی کە خـودا لەسـەرەتاوە دەزانێـت ئێمـە چ کارێـك دەکـەین و چـیمان بەسـەر دێـت، ئێمـە لەبەرپرسـیارییەتی هەڵەکانمان ڕزگار ناکات.. هەروەها ئەو ڕاسـتییەی کـە (ڕووداوێـك لـە قەدەرماندا نووسراوە) ئێمە لەبەرپرسیارییەتی دووڕناخاتەوە.

## مافی ناڕەزابوونتان لە قەدەر هەیە؟

"هەرشتێك لە ژیاندا بەسەرتا دێت جوانە".

پێمان باشە نموونەیەکی دیکەش باس بکەین...

دیزاینەری کارگەیەکی چنین، کەسێك بە کرێ دەهێنێت بۆ ئەوەی جلوبەرگەکانی لەسەر تـاقی بکەنـەوە، ئـیتر هەنـدێ جلی گرانبـەهای جوانی لەبەر دەکات و، هەندێکیان دەبڕێـت و کورتیـان دەکاتـەوە و ڕێکیان دەخات.. ئەو جلانەی لەبەر دادەکەنن و جلێکی دیکەی لەبـەر دەکەن، دواتر ئەو جلانەشی لەبەردا دەگۆڕن و، قاتێك جلی پێ تـاقی دەکەنەوە.

ئێستا ئەم کەسە مافی ئەوەی هەیە بڵێت: "ئێوە ماندووم دەکەن، هێندە ئەملاولام پێدەکەن تەواو هیلاك بووم، ئێوە ئەم هەموو جلە جوانە لەبەرمدا دەبڕن و پێم دادەکەننەوە، ئەمە بێ ویژدانییە ئێوە دەیکەن؟".

ناتوانێت وا بڵێت و مافی ئەوەشی نییە، چونکە سەرەتا بۆ ئەم کارەی کرێی وەرگرتووە، پاشان خۆ لە بنەڕەتدا جلەکان هی خۆی نەبوون، هی کارگەکە بوو کە ئەویشماڵی یەکێکی دیکەیە، بۆیە ئەم ناتوانێت خۆی وەك خاوەنی ئەو جلانە نیشان بدات.

هەروەکو نموونەکە (پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە)، پەروەردگاری خاوەنی هەموو شتەکان دەتوانێت ئەم جەستەیەمان بەهەستەوەر و ئەندامە جوانەکانی وەك چاو و گوێ و عەقڵ و دڵ بە شێوازی جیاواز جیاواز برازێنێتەوە.

هەندێ جار نەخۆشمان دەخات، بەلامان بۆ دەنێرێت، بەدەرد و ئازار تاقیمان دەکاتەوە، ئەوەتا جار هەیە مرۆڤ چاوەکانی لەدەستدەدات، گوێیەکانی هەستی بیستنیان نامێنێت.

– لەم بارودۆخانەدا مرۆڤ مافی ئەوەی هەیە ناڕازی بێت و هاوار بکات و بناڵێنێت؟

– نەخێر.

– بۆچی؟

- چونکە ئەم جەستەیە و ئەندامەکانی هی خودی مرۆڤ خۆی نین، بەڵکو لە لایەن خوداوە وەك ئەمانەتێکی کاتیی پێی بەخشراوە.

کەواتە پێویست ناکات لەکاتی سەختیی و ناهەمواریيدا لە خۆمان بدەین و ناڕازی بین، چونکە ئەو زاتە خاوەنی ماڵ و سامانمانە.. بەو ماڵ و سامانەی خۆی، بەپێی ویست و ئیرادەی موبارەکی ئێمەی مرۆڤی پێ تاقی دەکاتەوە، تاوێك لێمان دەسێنێتەوە، یا شێوەکانیان دەگۆڕێت، یا جەستەمان نەخۆش دەخات، بەڵا و دەردی بۆ دەنێرێت، لەپاشاندا شیفای دەدات...

کەواتە مرۆڤیش هەروەك ئەو کەسەی نموونەکە، لەسەرەتاوە کرێی خۆی وەرگرتووە.

- چۆن؟

- بە هەستەکانی، بە چاوی، بە گوێی، بە زمانی، بە لووتی و.. هتد، بە هەموویان چێژی لە ژیان بینیوە، ئەم چێژبینین و خۆشحاڵییەشی وەك کرێ بۆ هەژمار دەکرێت.

کەواتە هەموو ئەو ڕووداوانەی لە ژیاندا بەسەرماندا دێت جوانە، چونکە لە خوای گەورەن، کە خاوەنی ڕاستەقینەی جەستە و ڕۆحمانە.[1]

---

١- لە وتەی (بیست و شەشەم)ەوە وەرگیراوە.

# NUR DEDE
# ANLATIYOR

MEHMED PAKSU

(باپیره نوور) لە ماوەی نەوەد ساڵی تەمەنیدا لە هەموو پەرتووك و نووسراو و وانەكانیدا تەنها لەسەر یەك بابەت ڕاوەستاوە، ئەویش (ئیمان)ە.

- ئیمان چییە؟
- ئێمە چۆن بە ڕامان و بیركردنەوە لە بوونەوەران، بەدیهێنەرمان بناسین؟
- چۆن لە ناوە پیرۆزەكانی خوای گەورە وردبینەوە و لێیان تێ بگەین؟
- چۆن بتوانین پەروەردگارمان بناسین و باوەڕی پێ بهێنین؟
- بە چ شێوازێك لە قورئان بڕوانین و لێی تێ بگەین؟
- پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) چیمان فێردەكەن؟
- بەهەشت و دۆزەخ چین؟
- مرۆڤ بۆ چ مەبەستێك لەم دنیایەدا بەدیهێنراوە؟ ئەركەكانی سەرشانی كامانەن؟
- چۆن خودا بپەرستین؟ بۆچی دەبێت ملكەچی بڕیار و فەرمانەكانی خودا بین؟

هەوڵمانداوە بە ساناترین شێوە وەڵامی ئەم پرسیارە هەرە گرنگانەتان بدەینەوە و، سوودێك بە ئێوەی خوێنەری بەڕێز بگەیەنین..


0-0184-0000-0




نرخی (٤٠٠٠) دینارە

ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

ARA Media Center

www.aramediacenter.com

ara.m@hotmail.com

